کتێب: شنگال، هاییٚ ل من

بابەت: رۆمان

نووسەر: کەریم کاکە

نەخشەکار و بەرگ: سەرکەوت وەلی

نۆبەتی چاپ: یەکەم- 2019

تیراژ: 500 دانە

بایی: 5000 دینار

لە بەرکی نووسەر چاپ کراوە

## چەتریێ لە هەنجیر

لە بەری رۆژەوە دێ، بە دەرگای رۆژدا هەڵدەگەڕێ، ئەو دەرگایەی ئەسکەندەری گەورە، لە چیای شنگالی کردەوە، وەك دەڵێن هەوکەشپێوە، شوێن سمی ئەسپەکەی وی پێوە، ئەو ژنە لە گرتەی ئاسمانێوە، رۆیینەکەی کتومت تاوسە، بە شنگالدا هەڵدەزەنێ و دەکەوێ و قیتدەبێتەوە، تا گەیشتە بن چل مێرا، حەفتا و چەند جارێ کەوت و هەستایەوە.

ئەو هەموو کەوتن و هەستانەوەیە لە چەند خولەکیٚ، نیشانی پاك دنیا درا، دوای قرتان و بڕینێکیدی، ژنە لە تاوسچووەکە، لە بەری کانیی کەرسیٚ سەرکەوتەوە، بزر بوو، بە دیوی مەزارەکە لە سەر دوندی چل مێرا لە شێوەی سمۆرە دەرکەوتەوە.

وا دیارە، دنیا من دەبینیٚ!

ئەو رستە بە زاریدا هات و درێژەی بە خوێندنەوەی نامەکە دا:

کەژیٚ، ئەو تاوسە تۆ نەبی! دوهیٚ شەڤیٚ من خەونەکی هۆسا بە تۆوە دیت..

نامەکەی تەواو نەخوێندەوە، پلێکی گەیاندیٚ و گەیاندیە کۆتایی، ئیٚ ئەوە خوایە، لە دوا رستە ناوی خۆی نووسیبیٚ، ناو نەبوو، خرِی نەخوێندەوە، هەڵیگرت بۆ دوای وەڵامدانەوە، نووسی:

نازانم تۆ کێی، بەڵام تاوسەکەی بە شنگالەوە..

تەواوی نەکرد، کوژایەوە، مۆبایل وزەی تەواو، ناولەپێکی هێند توندی لە رانی خۆی دا، چەند قلە زەیتوونێك لە بەرِکیەوە

دەرپەرین و غلۆربوونەوە، ناو لەپێکی وا، ئەگەر فرۆکە  ئەوەی وێنەکەی گرت و بە دنیادا بڵاویکردەوە، لەوێ مابا، سەری لێدەشێوا و هەر لەوێ بە سەر سینگی  شنگالدا دەکەوت و هەر پارچەیەکی دەکەوتە سەر تاشە بەردێ، لێدانێ لە رانی خۆی دا، لە شنگال دەنگیدایەوە، بەڵام کەس نەیبیست.

نە وێنەگرەکە نە کەژێی سەری چل مێرا، نە کەس، نەیزانی لە دەرگای رۆژەوە بۆ سەری چل مێرا چەندی پێچوو، رۆژێ، کەمتر؟ کەس نازانێ، ئەوەی دنیا دیتی چەند خولەکێ بوو، ئاو بێن ەو دەست بشۆ.

کچی سەری چل مێرا، بەهاییداریەوە زاری بەزارکی دێمکەوە نا، لێوی کولایەوە، بە سەری پەنجەی زێرنەقووتەی نەرم نەرم شێلای، ژانی شکا، قلە زەیتوونەکانی خڕکردەوە، برسی بوو، لێ شنگی جوینی تێدا نەمابوو، خستنیە بەرکیەوە، تووڕەگەی پشتی کردەوە، چەقۆ گەورەکەی دەرهێنا، خستیە مستی و سەری بە تووڕەگە کرد و لە تەنیشت بنە گوێنییێ پشت لە رۆژ  لە سەر پشت راکشا..

هێند ماندوو و شەکەتە، بیری بە چ لادا ناچێ، لە شێوەی ورێنە، دەڵێ:

پیری چل چلە، بە قسەی تۆم کرد، رێی سەری شنگالم گرت.

کپ کەوت، دیار نیە، لە خۆچووە، یان خەوتووە، دەسکی چەقۆکەش، وەك بڵێی بە کەتیرەی بنە گوێنیەکەوە بە دەستیەوە نووساندبێت، پێوە نووساوە، وێدەچێ خۆی بۆ شتێ دانووساندبێت، لە بێئاگاییشەوە بەریناداتَ.

لە ئاسمانێ پەلە هەورێکی کەپرۆکەیی لە دووکەڵی سپی دەچێ، رەنگە هەر دووکەڵیش بێت و خۆی لە شێوەی هەور نیشاندابێت، لە بەری رۆژێ پەیدابوو، بۆ ماوەی سەرخەوشکانێ لە راستی وی راوەستا و سێبەرێکی تەنك تەنکی لێکرد، تەنکتر لە سێبەری پۆلە پەپوولە.

رۆژ بە دیوی فرەهات و چۆلەوانیدا تەواو لاربۆتەوە، سێبەری بنەدار و گابەردان درێژبوونەتەوە، لە کەلێنی لك و پەلکانەوە، تیشکی رۆژ وەك بڵێی بۆ وێنەگرتن رووناهیی بداتێ، کەوتۆتە سەر روخساری.

بە شێوەییێ راپەڕی، دەتگوت لە دەستی ئالاڕەشان خۆی ڕاپسکاندووە، هێندەی نەمابوو، نووکێ چەقۆ لە نێوچەوانی خۆی راچیێ، چاوی بە دەوری خۆیدا گێڕا، هیێ لە خۆی کەس بە شنگالەوە نەبوو، چەقۆکەی لە زەوی چەقاند، توورەگەی کردەوە، نانێك لەویێ و گۆلە زەیتوونێکی لە بەڕکی دەرهێنا، لەتاو کولانەوەی لێوی تا تەواوی کرد، زۆری برد، زەیتوونەکانی بەڕکیشی رووکردە توورەگەوە، ئەو ساتەی بیرکەوتەوە کە پێڕانەگەیشت زارکی توورەگە بکاتەوە و زەیتوونی تێکات، لە بای غاریێ مستێکی لێدا و گوڕی کردە بەڕکیەوە.

هەلّکشا، کەمێکیتر بە چل مێرای شنگالا هەلّکشا، لە تەك پنچکیێ کە لە دوورەوە لە پیرێژنێکی سەر بە قەزمە دەچوو بە دیار دەستەسڕەوە دانیشتبێت، لە سەر چیچکان دانیشت، سەری لە شێوەی گیا سەئاتۆکە دەسووڕا، چاوی لە ئالی شاری شنگال دەگێڕا، لە نێوان داربەڕووێك و گابەردیێ دیتیەوە، چ دیار نیە، بەلّام بە گوێرەی رۆژ و سووڕانەوەی، دلّنیا بوو کە

شنگال کەوتۆتە ئاستی کەلێنی ئەو دار و بەردە، روو لەوێ پێی لێ راکێشا.

برژانگی بە ئاسمانی شاری شنگالەوە گرێدا، دووکەڵە، دووکەڵێ بە لای شینی خۆ دەنوێنێ، بەری ئاسمانی گرتووە، تا دێ شینتر هەڵدەگەڕێ، شینێکی تاریك، ئەو رەنگەیە کە دەمێکە شنگالنشینان بە دیتنی وی سەر و دڵیان تێکدەچێ، دەست بە چاویانەوە دەگرن و روو وەردەگێڕن، ئەو رەنگەی شین و رۆڕۆ و گازی مەرگی تێدا رەنگدەداتەوە، ئەو رەنگەی چەندان پشتە، لە سێبەری ئەو و ئەو رەنگانەی لەو رەنگە رەنگدەدەنەوە فەرمانی مەرگ هاتووە، کەژێ بە دیتنی وی رەنگێ، هێندە رەنگەی بە روویەوە مابوو، ئەویش پەڕی، دنیای لە بەر چاو تاریکتر داهات.

چەقۆکەی لە بەر چاوی راگرت، هێند بە رقەوە تێیدەڕوانی، هەموو لەشی کەوتبووە لەرزین، چەند جارێ لە لێوی نزیککردەوە، دەیویست، زمانی پێدا بێنێت و ئەو خوێنە بلێسێتەوە کە پێوەی وشکبۆتەوە، پەشیماندەبۆوە،

بیریدەکەوتەوە، خواردنی خوێن لە ئایینی وان ڕێگە پێنەدراوە، سەری پەنجەی دۆشاومژەی چەپی، گەیاندە برینەکەی لێوی، دنکە زەیتوونێکیدی خستە زاری، بە دەم جوینەوە، تیچاوێکی خستە سەر چەقۆ خوێناویەکە و هەناسەیەکی هەڵکێشا و لەگەڵ دانەوەی:

خوێن خوێن دەشواتەوە.

ڕادەبێ، سەرێ بۆ سەرێ، سەرێ بۆ خوارێ، بە هەر چوار لادا دێ و دەچێ، چاو دەگێڕێ، گوێ ڕادەدێرێ، جگە لە بەرد و داروبار چ دیار نیە، جگە لە دەنگی نەرمی هەناسەی خۆی چ دەنگێ نابیستێ، دنیا (با)شی لە شنگال گرتۆتەوە، نووزەیەکی نایێ، ئەدی ئاژەلێ، باڵدارێ؟ خۆ شنگال بەقەد سەد چیا باڵداری هەیە، نیە، نە فڕینێ نە خوێندنێ، هیچ، کەژێ، لەو چۆلەوانیەی چیا ترسا، بە لێو لەرزینەوە:

تۆ بڵێی، لێرەش ژیانیان قڕکردبێ!

وای گۆت و سەرتر هەڵگەڕا، ئێرە بڵندایی چل مێرایە، لە قەدی دوندێ کە لە دوورەوە گەلێ لە گومبەزی ئێزیدیان دەچێ،

لەوێ لە لای دوندەکەوە چووە سەر کەڤرێ کە دارهەنجیرێکی لە بارستەی خۆ گەورەتری لە وێنەی چەتر لەسەر سەر راگرتووە، سەر کەڤرەکە تەخت تەخت، دەتگوت تاتی نوێژییە، تەختاییەکە بەرینی گەزێ و درێژاییشی بە قەد بەژنی کەژێ.

پشتی دا قەدی دارەکە و چاوی بەناو لق و پۆیدا گێڕا، پێنەدەچوو زرِ بێ، بەڵام چ هەنجیری پێوە نەدی، ئەو شوێنەی لێی دانیشتووە، بیریکەوتەوە، هەر دەبێت ئەو شوێنە بێت کە نزیکەی هەزار و پێنجسەد گەزێ لە ئاستی دەریا بڵندە، ئەو جێیەیە کە لافاوەکەی نووحی نەگەیشتێ، بەوە ئاهێکی بە بەر گەڕایەوە و ترس رەویەوە، لە بەر خۆیەوە:

پیری چل چلە، لە سەر قسەی تۆ، لێرەم، ناترسم، مەرگ ناگاتێ.

تیکە نانێك و چەند دنکە زەیتوونێکی خوارد، سێ چوار قومە ئاوی بە سەردا کرد، توورەگەی کردە سەرین، گابەرد رایەخ، هەنجیری بە خۆدا دا، دێمکە لە نزیك سەری و چەقۆ لە

دەست و لە سەر تەنیشت ڕاکشا، شنگ و تینی بیرکردنەوەی تێدا نەماوە، چووە تاریکایی شنگالەوە..

لە گرموهۆڕ بەئاگا هاتەوە، تاو کەوتبوو .

## ماره ڕەشەکە

## کەشتیی ژیان

بە شێوەیێ شێواوە، نازانێ زرموهۆڕەکە لە کیهە لاوە دێ،
وێدەچێ لە هەموو لاوە بێ، چیای شنگال بە قرمە و ویزەی
گەلەك جۆرە چەکوچۆل دەوردراوە، بە دەنگێك بە ئاستەم خۆی
دەیبیستێ:

مردن ئاوخواردنەوەیە، لێ کەوتنە بەر دەستان چ بە
مردوویی چ بە زیندوویی، نابێ ببێ، ژارە و قووتنادرێ.

دێ و دەچێ، چاودەگێرێ، وێدەچێ بە دوای کەندڕێ، کەلێنە شاخێ، کونێ بگەڕێ، تا تەرمی خۆی لێ بشارێتەوە و بە کەس نەبینرێتەوە، دەنگی تۆپان دێ، دار و بەرد دەلەرێنەوە، لەرینەوەیەك، چ بوومەلەرزەیەك بەو رەنگە لەرزی نەخستۆتە شنگالەوە، لە چاو گێڕان ناکەوێ، لەو سەر بەرد بۆ ئەو سەر بەرد، لەو بن دارەوە بۆ بن ئەو بنەدار، نابینێتەوە، جێییەکی لاچەپی نەدیو، نابینێتەوە.

تۆ بڵێی بە دوای جێ تەرمی خۆیدا بگەڕێ؟!

لە پڕ روو لە رۆژێ، قیت رادەوەستێ، نەرم نەرم لێو دەجوولێنێ، وەك بڵێی نزا بخوێنێ، دوای کەمێ، کەمێ دەنگ هەڵدێنێ:

چیای شنگال کەشتیەکە نوقم نابێ..

ئەوە گۆتەی سەر زاری پیری چل چلە بوو، وەبیریهاتەوە و روو لە رۆژێ گۆتیەوە، دوو سێ قومە ئاوی خواردەوە، ویستی زمانی بگەیەنێتە سەر برینەکەی لێوی، گورج زمانی کشاندەوە زاری، لە چاوپڕا دەخوێنرێتەوە، نایەوێت زمانی بە لێوی پیس

بکات، ئاخر لە هەڵسوکەتی دیارە، ئەو بەشەی لێوی کە برینە گچکەکەی پێوەیە، هەر هێندەی جێ ددانێکی گچکە دەبێ، بەشتێکی پیس و زیادەی بزانێ، نابینی هەر جارێ پەنجەی دەداتێ، بە بەردێ، شتێ دەیسڕێتەوە، رەنگبێ ئەگەر لە دەستیبێ، ئەو بەشەی لێوی لێبکاتەوە و توورِیهەڵدا..

ئێستا بە دیوی گەلیی کەرکەسێ چووە بن بنە دار بەڕووێ کە هێندەی بەژن و نیوی خۆی بڵندە و هێند پڕ پەلکە، دەلێی لە تەمەنی نە سووتانی دیتووە، نە پایز مێوانی بووە، لەو سێبەرە چڕەوە چاوی داوەتە تاشەبەردان، تاشەبەردی بەری چل مێرا، ئەو بەردانەی لە دوورەوە رەش رەش، کتومت بەری سێرن، لێ دەمێ نزیکدەکەویەوە، سۆر هەڵدەگەڕێن، سۆرێکی تێرن، تاشەبەرد لە بن رۆژی هەیڤی گەلاوێژێ، دەتریسکێتەوە و تیشکان داوێژێ، بە چەند رەنگێ رەنگدەداتەوە، گۆتەیەکی پیری چل چلەی بیرکەوتەوە:

هەر تیشکە ڕەنگێ لە تاشەبەردەکانی چل مێرا، دیرۆکێکە لە گێڕانەوەی شنگال، شنگالی سینە برینداری زار تژی لە نالەنالێ.

کەژێی بە کەژی چل مێرا کەوتوو، کەوتۆتە خەیالێ، بە تۆپیش ناگەڕێتەوە، ئێستا کەس نازانێ دێری سەر تاشەبەردان دەخوێنێتەوە، یان گۆتنەکانی پیری چل چلە دەلێتەوە:

چاودێ، ئەو تاشە ڕەنگ تێرە، چیرۆکی کەشتی و ماری ڕەش، وشە وشە نیشاندەداتەوە:

لافاوێ هەستاوە، هی وا نەبووە و نابێتەوە، هەمی زەریاکانی دەگەلێ خری هێناوە، زەوی تا نزیك ئاسمان ئاوە، زەوی هێ لە شنگال ناولەپێ وشکانیی پێوە نەماوە، زەوی سەراسەر زەریایە، چیای شنگال ئاو تا سەر شانی هاتووە، هەوکە ئاقاری چل مێرا تاقە دوورگەی دنیایە، لە دووڕرا لە کەشتی دەچێ.

ئەها، کەشتییێ لە بەری لالشەوە رووە و شنگال دێ، گەیشتێ، کەشتیەوان دەست رادەشەقێنێ بە سێ دەنگا گازدەکاتە خەلکی وێ ئاقارێ:

ئەز نووحم، خودا رایسپاردووم بێژمە نگۆ، رزگارکەری گیانلەبەر و زیندەوەرانم، ئەگەر ناتانەوێ، تۆو و بنەچەتان ببڕێتەوە، سواربن..

کەسێ لە سەری چل مێرا، وا باگۆی نووح دەداتەوە:

شنگال خۆی کەشتیە، بن ناکەوێ، ئاو بگاتە ئاسمانێش شنگال نوقم نابێت، ئێوە دابەزن..

نووح سەر بادەدات و بادەداتەوە، بەرەو جوودی بادەداتەوە، لەو رێیە کەشتی کونی تێدەبێ، کەسیش هەست پێناکات، مارەکە نەگەیشتبا، بن ئاو دەکەوت، هەموو بە نووحیشەوە تێدا دەچوون، مەلەك تاوس، هەستپێدەکات، دێت لەو شنگالەی خۆمانەوە، مارێکی رەش رادەسپێرێ، مار هێندەی بلێی یەك و دوو، دەگاتێ، لە سەر کونی کەشتی پەپکە دەخوات ونووح و کەشتینشینان لە مردن رزگار دەکات، هەر لە بەر هەندێش ماری رەش پیرۆزە و نووحیش شنگالی پیرۆزکرد.

کەژێ لە خوێندنەوە و گوتنەوەی دێری ماری رەش پیرۆزە نەبووبۆوە، لە تەنیشتیەوە خشەیێ هات، تەماشادەکات،

مارێکی ڕەشی بەژنیٚ درێژ، بەرەو ئەو تاشە بەردە دەخشیٚ کە چیرۆکی کەشتی و ماری بە تیشکی رۆژیٚ لە سەر نووسراوە، مارەکە بە سەر چیرۆکی خۆیدا ئاودیو بوو، لە ئاودیوبووندا، ئاوڕێکی دایەوە، یەکەم جاری بوو، ئاوڕدانەوەی مار ببینیٚ.

رادەچلەکیٚ، بەرزەپیٚ هەردەستیٚ، بە لێو لەرزینەوە، بە دەنگێکی بەرز، بۆوەی کەسیٚ ئەگەر لەو ناوە هەبیٚ، وەلامی بداتەوە:

من لە کوێم؟ ئەوە چیە روودەدات؟ خەونە، چیە؟ پیری چل چلە لە کوێی؟ ..

جگە لە خۆی کەس دەنگی نەبیست، پیری چل چلە رەنگە ئێستا گەیشتبێتە بەهەشت، یەکپیٚ بەرەو کانیەکە چوو، دێمکەکەی پڕکردەوە، پێلاوی لە پیٚ کردەوە، پێی خستە ناو ئاویٚ، دەموچاوی شووشت، لێوی کولایەوە:

تۆ، بە کانی سپی نەبیٚ، خاوێن نابیەوە.

لە سەر ئەو کانیەی دەرژێتەوە گەلیی کەرسیٚ، زۆر شتی گۆ، لیٚ دەنگی هیند نزم بوو، خۆیشی نەیدەبیست، دوو سیٚ پاروە

نانی خوارد، سەر و پرچی تەڕکردەوە، ئەوەی نەیهێشت پشکە ئاوێکی پێبکەوێ، چەقۆکەی بوو، هاتەوە سەرەخۆ و بە ڕێی خۆیدا گەڕایەوە و دڵنیابۆوە، ئێرە مەزاری چل مێرا و دوندی چل مێرایە و لە سەر قسەی پیری چل چلە، هانای بۆ ئێرە هێناوە، وەبیریهاتەوە کە دیسان فەرمانە و ڕەش دەوری چیای شنگالی داوە، ناولەپێکی پەشیمانی لە چۆکی خۆی دا و گۆتی:

حەیف، زوو بە قسەی تۆمان نەکرد.

گوتەکای چەند مانگ لەوە پێشتری پیری چل چلەی بیرکەوتەوە، ئەوەی لە بازێڕێ شنگالێ، لە گەڕەکی منارە، بە دەوری منارەدا دەسووڕایەوە، منارەی شاکاری شار، منارەی بانگەواز، ئەو منارەی تەمەنی نووحی هەبوو، ئەو منارەی پێشترێ سێزدە چاردە بەژنە زەلام، بەژنی بوو، ئەوەی زوو، جێی جاڕدان بوو، لەو منارەیەوە ئێزدی ئاگاداردەکرانەوە لە دەرچوونی فەرمان و هاتنی لەشکری فەرمانان، لەشسووکێکی دەنگ زولال سەردەکەوتە سەر منارە، بە دەنگێك کە لە چیای شنگال دەنگیدەدایەوە:

دیسان فەرمانە، ل مە فەرمانە، گەلی عەگید و خۆش مێرا، رابن، خۆ ببەستن، بەرسینگێ دوژمن و نەیارا بگرن..

پیری چل چلە بە دەوری منارەدا دەخولێتەوە، بۆ کچ و کوڕانی ئەو ناوە دیرۆکی فەرمان دەگێڕێتەوە، هەندێك پێپێدەکەنن و وا دەبینن دین بووە، بەڵام ئەو گوێناداتیێ، دیرۆك دەگێڕێتەوە، ترس و فەرمانی دادیێ دەگێڕێتەوە:

فەرمان لە رێیە، لە سەردەمی عەیازی کوڕی غەنەمەوە لە رێیە، لە سەردەمی بەدرەدینی لوئلوئەوە لە رێیە، لە سەردەمی ئەبوو سعوودی موفتیی ئۆسمانیەوە، فەرمان بۆ قڕکردنی ئێزدیان لە رێیە، گەلەك باوەڕ بە هاوزمانیێ خۆش نەکەن، ما نازانن ئەوانیش موحەمەد موسافیریان هەبوو..

ئێستاش لە رێیە، کەس بە هانای ئێزدیانەوە نایێ، تەنها چەك و چیا، چیای شنگال، لە بەر هەندێ راهێنان لە سەر چەك بکەن، خۆ فێرە بە چیای شنگال هەڵگەڕان بکەن و چل مێرا پشتیوانییێ هەوە دکەت..

کچی بە چل مێرا کەوتوو، قسەی ئەو گەنجەی بیرکەوتەوە کە ئاوا باگۆی پیری چل چلەی دایەوە:

ئیرۆ رۆژی چەك نەمایە، هەر فەرمانیٚ دژیٚ مە دەربچیٚ، دنیا هەمی دزانیٚ، دنیا بۆتە گوندەکی گچکە، لە کۆچۆ گچکەتر، ناهێلن تشتیٚ هۆسا بقەومیٚ..

پیری چل چلە، لە بن سمێڵەوە بزەیەکی تاڵی بۆ گەنجەکە کرد، زانی کەس گوێی لێناگریٚ، رێی نائومێدیی گرتە بەر، کچە ئەو گرتەشی هاتەوە بەر چاو:

ئەها، پیری چل چلە، لە سەر دەرگای ماڵیٚ، دەڵیٚ:

کچا من، من و تۆ جگە لە یەك و دوو، کەسمان نیە، بە قسەی مامیٚ خۆ بکە، خۆ فێرە چەك بکە و ئەگەر شتیٚ قەوما، بیٚ ئێك و دوو رووە و چل مێرا، خودا چەپەرەت دەدا.

کەژیٚ بۆ ماوەییٚ لە چل مێرا دابڕا، گەیشتەوە ناو باژێڕیٚ شنگالیٚ و منداڵانە بە دەوری منارەی شاکار، منارەی دیرۆکیدا دەخولایەوە، لە پەرژینەکە ئاودیو دەبوو، بە دیاریەوە رادەوەستا و شوێنەوارناسانە چاوی لە سەر نەخش و نیگارەکان

رادەگرت، لێیەوە هەشت سەد ساڵێکی شنگالی دەخوێندەوە، دیتی گەنجێ بە پڕتاو هات و بە ژۆر کەوت، پاش کەمێ لە سەر منارەوە سەری دەرهێنا و بە دەنگێکی حێل:

هات، ئالاڕەش هات..

لە دەنگی وی بەئاگا هات و هاتەوە چل مێرا، تەماشای دەستی کرد، بە دیتنی چەقۆکە هێور بۆوە، هەندێ سەرتر هەڵکشا، شنگال کەوتە تاریکی، کزەبایێ فێنك فێنك هەڵیکردووە، هەستدەکات لە خوارەوە، دەنگە دەنگ دێت، باوەڕ بە گوێی خۆی ناکات، گەیشتەوە سەر گابەرد و بن هەنجیرەکە، شتێکی خوارد، تیلمە پەڕۆیەکی باریکی لە توورەگە دەرهێنا، دەسکی چەقۆکەی توند لە ناو لەپی بەست، لە شێوەی شەوادی پالی دایەوە، لە کەلێنی پەلکانەوە، دوو سێ ئەستێرەی دی، دەدرەوشێنەوە، سەربانی خۆیانی بیرکەوتەوە، ئەو دەمەی منداڵ بوو، لە تەنیشت پیری چل چلەی مامی لە سەر پشت راکشابوو، ئەستێرانی دەژمارد، بە دیتنی ئەستێرانی کەلێنی پەلکی دارهەنجیری سەری چل مێرا، ئۆخژنێکی بە

گیاندا هات، تا درەنگانی شەو وەك ئەوەی چیرۆك بۆ منداڵان بگێڕێتەوە، قسەی بۆ شەوی شنگال کرد، بەرەبەیان خەوی لێکەوت، دەنگی تەنبوور نەبا، وا زوو بەئاگا نەدەهات.

*ئاته بەرد*

## *گزربوونەوە ئادەم و حەوا*

بە دەنگی تەنبوور لە خەو رابوو، سەرەتا لای وابوو لە ماڵێیە و عەودالی تەنبوورژەنی کۆلانێیە، تەنبوور دەژەنێ، لە بەردەکە هاتە خوارێ، سەری هەڵبڕی، رۆژ گەیشتۆتە ئاسمانی شاری شنگالێ، ئەو لا تەنبوور ئەم لا تەنبوور، تەنبوورژەن دیار نیە، دەنگ هەیە و رەنگ نیە، لە بایەك دەچێ، هەر جارەی لە لایێ هەڵبکات، زۆر گەڕا، شنگی لە بەر بڕا، تەنبوورژەنی نەدیتەوە، چەند جارێکیش گازیکرد:

هۆ تەنبوورژەنۆ، هۆ...

وەرام لە بەردەوە هات، لەوەوە نەهات، چوو، پشت لە ڕۆژێ، ڕوو لە تاشەبەردان ڕوونیشت، دەنگی تەنبوور دێ و ناپسێتەوە، هایێ هایێ دەڵێتەوە.

لە تەنبوورەوە، تەنبوورەکەی ئادەمی بیرکەوتەوە کە پیری چل چلە هێند ناسك دەیگێڕایەوە، مردووی زیندوو دەکردەوە، چاوی لە سەر تاشەبەردێکی بن ڕۆژێیە، لەو بەردانەی چیرۆکی شنگال نیشاندەدەنەوە، دەخوێنێتەوە، دەگێڕێتەوە:

ئێزد لێرە، لە ئاو و گڵی ئێرە ئادەمزادی هێنایە دنیا، بە دەستی خۆی گلی پیرۆزی شنگالی شێلا، ئادەم و حەوای لە گڵ و ئاوی کانیی کەرسێ شێلا، لە سەر تاتە بەردێ، لەبەر تیشکی ڕۆژی شنگالێ هەڵیخستن، کزر بوونەوە، وشکبوونەوە، حەفتسەد ساڵی خشت هەر بە خشتی مانەوە، چەندی گیانی دەنارد، نەدەچووە لەشی ئەو ژن و پیاوە خشتەوە، گیان نەدەچوو، نەدەچوو، ئێزد بیریکردەوە، هۆی ئاوێتەبوونی گیان و قوڕی دیتەوە، گازی کردە تاوسی مەلەك:

هەڕە، تەنبوورەك بینە.

تەنبووری هێنا، بە دیار قوڕەوە، ژەندی، ئاوازی گیان و ژیانی ژەنی، لە شێوەی ئەو عەودالەی خۆمان ژەنی، لەپڕ ژن و پیاو قیتبوونەوە، چاویان بە شنگال بەو (لا جوان)ەی دنیا هەڵێنا، لە شنگالەوە خاك و با و ئاو و ئاگریان ناسی، لەوێ هەنجیر و ترێ و هەناریان تامکرد، بە هەنگوینی شنگالێ شیرینیان بە ژیان بەخشی، لە سەر تاتەبەردی شنگالێ کڕنووشیان بۆ ئێزدی مەزن برد، زاوزێیان کرد، بە ئاوی کانیی کەرسێ و شنگال و بارا و جێ دارا خۆیان شووشت، زۆر بوون، شنگال ئەو هەموو کچ و کوڕەی حەواو ئادەمی نەدەگرت، بە گەلیی کەرسێدا هاتنە خوارێ و بە هەر چوار ئالی دنیادا پەرتبوون..

لە وێ رۆژێوە تا بن ئاوکەوتنی دنیا و پەیدابوونی کەشتیەکەی نووح، مرۆ لە هەر جێیەکی دنیا با، شنگالی بە زێدێ خۆ دزانی و لە دوورەوە پیرۆزی دەکرد، پشتی لافاوەکە و زۆربوونەوەیان پێوەندیان بە شنکالەوە پچڕا و لەبیریان چۆوە، لە هەینیێوە، تاوسی مەلەك، ناوی لە شنگالیان نا:

ئێزدی

ئاخر تنێ خەڵکێ شنگال لە سەر دینێ خودێپەرستی مانەوە، ئەوانیدی کەوتنە پەرستنی بەرد و ستێرە و شتی هۆسا، پاشی هەندێ، هەندێ ئێزدی لە چیا هاتنە خوارێ و گەیشتنە لالش و لەوێوە پەرتبوونەوە، لەو لایەوە تا بن بەغدا، لەو لاوە لە هەمەدان و بەو دیودا، لە سەرتر گەیشتنە بن دەریایێ رەش، لەو سەرەش گەیشتنە دەریای سپی، لێ تا درەنگ هەر بە ئێزدی مانەوە.

کچا من، تو بزانە، چیای شنگال، لاندکە، لاندکی مرۆڤینی، هەر کەسێ تیرێ، فیشەکێ بە شنگالەوە بنێ، هۆڤە، نە مرۆڤە.

وشەی فیشەك، کەژێی لە تیشك و دێری سەر تاشەبەردان کردەوە و هێنایەوە بن بنە دارەکە، هەستی کرد لە خەونێکی بڵندەوە بەربۆتەوە، بەرزەپێ چووە نزیك تاشەبەردەکە، جێ جێ چاوی پێدا دەگێرا، چ نووسینێ، نەبوو، ترس دایگرت، هاواریکرد:

مامۆ، پیری چل چلە، تو چ  بە سەر من ئینا؟

دەنگی تەنبورر تا دێ نزیکتر دێتە گوێ، لە ئاوازێکەوە بۆ ئاوازێ، لە تەنبوورەکەی عەودالی تەنبوورژەن دەچێ، ئەوەی باڵداریش بە بیستنی بە پرتاو لە سەر لقێ، شتێ دەنیشتنەوە و لە گمە و جووکە و خوێندن دەکەوتن، لەو تەنبوورە دەچێ کە گیانی بەخشیە ئادەم و حەوا.

سەری هەڵبڕی، بازێ بە هێواشی لە سەر دوندەکەی بەرانبەری نیشتەوە، دوو سێ باڵدار- بە چاوی ناسینەوە چاوی نەدانێ- خۆیان کرد بە ناو داربەڕووەکەی تەنیشتی..

لەوەتەی لێرەیە یەکەم جارە باڵدار ببینێ، لە کاتێك شنگال بە قەد پەلکی داران باڵداری هەیە، چ باڵدارێ نیە ئێزد باڵی دابێتێ، لە چیایێ شنگالێ باڵی لێکنەدابێ.

لە هیکرا دەنگی تەنبوور بڕا، باڵدار پەیدا بوون، یەك یەك، دوو دوو، پۆل پۆل، هەڵدەفڕین و دەنیشتنەوە، لە هەر لقی درەختێکەوە، ئاوازێ، مەستانە ئاواز ئاواز، ئاوازی تەنبووریان دەگۆتەوە، کەژێ لە پیری چل چلەوە بیستبووی:

ئاواز لە ئایینی ئێزدیانەوەیە، باڵداریش ئاوازی تەنبوورەکەی مەلەکی تاوس دەخوێنن.

لە تەمەنی ئەو شێوە مەستبوونەی باڵدارانی نەدیتبوو، لە باڵدارانەوە ئەو هەموو ئاوازەی نەبیستبوو.

کەژێ بە خوێندنی مەلان مەست بوو، مەست مەست، بە ناو ئاوازاندا شۆڕبۆوە بەرەو کانیەکە، لە سەر کانی چاوی بە دەوروبەری خۆی گێڕا، لە دڵی خۆش هات کەس دیار نیە، گرێی دەستی کردەوە، چەقۆکەی دوور لە ئاو، لە سەر بەردێ دانا، رستەیەکی پیری چل چلەی بیرکەوتەوە:

لە هەر جێ بی، خۆ پاکژ راگرە.

توورەگەی کردەوە، گەڕا، دیتیەوە، سابوونە حەلەبیەکەی دیتەوە، جلکی پیاوانەی داکەند، جلکی ژنانە دەرکەوت، هاتەوە بیری فریای جلکگۆڕین نەکەوت، ئەو جلکەی لە پلکە ئۆفای ژنی عەودالی تەنبوورژەنی وەرگرت، لە بای غارێ بە سەر ئەوانیتردا هەڵیکێشا و دەرپەڕی..

جلکی ژنانەشی داکەند، ئێستا رووت رووت، وەك ئەو کچەی
بە بەر چاویەوە کابرا رووتیکردەوە و چووە سەری، کاتێ دیمەنی
کچە هاتەوە بەر چاوی، خۆی بیرکەوتەوە، پەژیوانبۆوە لە
رووتبوونەوە، ویستی بچێتەوە ناو جلکەکانی، پەژیوانبۆوە لە
خۆ لەبەرکردنەوە، لە خوار کانیەکە بە سێ چوار شەقاو، گۆمێ
لە بەرد هەیە، سەد سوێند دەخۆی بە دەستی مەلەکی تاوس
بۆ وی هاتیتە چێکرنێ، سەرەتا جلکە ژنانیەکانی شووشت و لە
سەر کەڤرێ هەڵیخستن، ئەوجا بە سابوونی حەلەبیەوە چووە
ناوی، جوان جوان خۆی شووست، هەر جارێ سەری دەخستە بن
ئاوێ و لێوی تەڕدەبوو، دەیگۆ:

تو بە کانیا سپی پاکژ دەبیەوە.

دەمەو ئێوارەیە، لە چیایێ شنگالێ، دەنگ هەر دەنگی
تۆپانە، نە تەنبوور دێتە گوێ، نە جریوە و گمەگەم و خوێندن و
قاسپە و قاژە و هیچ..

نەرم نەرم سەرەو مالێ هەنگاوان دەنێ، مالا کەژێ، سەر
کەڤر و بن دارهەنجیرەکەی بلندایی چل مێرای چیای شنگالێی

روو لە رۆژهەلاتە، لە رێی مالا خۆ، دەنگان دەبیستیٚ، نزیکن، بە گوێی مشك گویٚ رادەدێریٚ، بۆوەی یەك وشە ببیستیٚ، تا بزانیٚ چ زمانە، نابیستیٚ دەنگە دەنگە و وشەییٚ نابیستیٚ، تا دیٚ نزیکدەبنەوە، چەقۆکەی توند گرتووە، دەست لە سەر سینگی خۆی دەگێریٚ، وەك بلێیی جێی دلی بزرکردووە و لە دوای دەگەڕیٚ، هەراوزەنایە و نازانیٚ چ زمانە..

بە چەقۆوە روو لە ئاسمان دەکات:

خودیٚ، هەگەر ئەو دەنگە دەنگە، دەنگی عارەبانە، بێژە من..

دەنگی رۆم و عەجەمیشی بیرکەوتەوە بەلام بە خودای نەگۆ، پیری چل چلە زۆر جار دەیگۆ:

کەژیٚ، لە دەڤەری شنگالیٚ لە دەڤەریٚ لالشیٚ لە هەر کەژیٚ دەنگی عارەب و عەجەم و رۆمت بیست، بزانە باس باسی سەرە، سەری ئێزدیان، خۆ لە چاڤان وندا کە، خۆ بگەیەنە چل میٚرا.

دەنگ نزیکدەبێتەوە و دیار نیە چ زمانە، هی دۆستە نان دوژمنانە..

پتر هەڵکشا، ترسێکی وای نەما، لەو دەمەو ئێوارەیە باوەڕی تەواوی بە چل مێرەکەی پیری چل چلە هات:

+ کچا من، تو بزانە، هەر ئێزیدییێ، بگاتە چل مێرا، دەستی نەیاری ناگاتیێ، ئەگەر هەمی تیر و شیر بەدەستی رۆم و عارەب و عەجەم، هی کوردی بەگەڵ کەوتووش دەوری بدەن، کەپووی بە خوێن نایە..

-چەوا؟

+ ل وێرێ، چل مێر هەن، لە بن فەرماندەی مەلەکی تاوسن، ئێزیدی نایانبینن، بەڵام لە چاوی نەیارانی ئێزیدیەوە جوان دیارن، باسك و رانێ وان داریەڕوون، سینگێ وان تیشە شاخن،، شیر و تیر نایانبڕن، هەر مێرێ لەو چل مێرە چل مێری ئێزدیانی تێدەبێ، هەر مێرەکی ئێزیدیش چل مێری نا ئێزیدیانی تێدەبێ..

کچا من تو بزانە، ئازایەتی، لە ئاییني ئێزدیانەوەیە؟

کچی به چل مێرا کەوتوو، گوێی نەدایە دەنگە دەنگی بە شنگالدا هەڵگەڕاو، گەیشتەوە سەر کەڤر و بن دارهەنجیرەکەی خۆی، ئەو شەوە لەشی سووك بوو، زوو خەوی لێکەوت بەیانی دابوو نەدابوو، لە هەرا و زەنا وەئاگاهات.

## دیرۆک

## بن پەنجەی رۆژ

هەراوزەنا زۆر نزیکە، هەستدەکات لە بەری کانیەوە دیٚ، چەند بەردیٚ دەچیٚتە پیٚشیٚ، لەگەل بنە داریٚ خۆی دەکاتە یەك و برژانگی لە کەلیٚنی ئەو دوو تاشەبەردە گریٚدەدات کە دەلیٚی دەرگان بە سەر دیوی نەدیوەوە، بە سەر لیٚژ بوونەوەدا، ئەگەر سەرکەون هەر دەبیٚ لەویٚوە دەرکەون:

گەهشتین..

به بیستنی (گەهشتین) شاگەشکە بوو، ویستی بە بازێ خۆی بگەیەنێتە گەهشتین، شتێ ساردی کردەوە، تێنەگەیشت چیە، لەگەڵ درەختەکە خۆی کردەوە یەك و لە چاوەڕوانیدا ما، زۆر ما، نە کەس دەرکەوت، نە دەنگ ما.

چوو، چەقۆی رووت بە دەستەوە، بە پێدزەوە چوو، بە شپرزەیی و چۆك لەرزینەوە ئەو ناوەی ورد ورد پشکنی، هەست و خوست نەبوو، گەڕایەوە:

تۆ بڵێی گوێم زرینگابێتەوە!

دەنگەدەنگ شوێنی گۆڕی، لە لایەکیدی بەرزبۆوە، پێنەکەوت لە کوێوەیە، ئەو جارە هێندە گوێی پێنەدا، تیشکی رۆژی سەر تاشەبەردێ، بردیەوە لای پیری چل چلە، تیشك پیت پیت، وشە وشە، رستە رستە، سپی سپی رژایە سەر لاپەڕەی بەرد، بەردی مەیلە و زەرد، بە ئاستەم دەخوێندرایەوە:

وەڵات هەموو ئێزیدینە، هەموو لە سەر دینی خودێنە، ئایینی بێگەردی خودایی، بێ پەیامبەر، خودێ و بەس، ئایینی

سرووشت، ئایینی ئاواز و ڕەنگ و تیشك و كەسكایی و میهرەبانی و بوێری و..

دنیا چاوی بە ئێزیدیان هەڵنەهات، دابڕدابڕی كردن، كەسێ دەركەوت، ناوی وی زەردەشت بوو، هات لە بن گوێی ئێزدیانی خوێند، گوتەكانی گەلەك ڕێكوپێك بوون، ئایینێ ویش گەلەك لە هی ئێزیدی دوور نەبوو، ئەو پەیامبەرە زۆریی ئێزیدیی لە ئێزدی خۆمان كردەوە و بردنیە سەر ئایینی خۆی، ڕۆژ دوای ڕۆژ، **ئێزیدی** كەم دەبوونەوە.

ردێنسپیی هەینێی ئێزیدیان ترسیان لێنیشت، ترسی نەمانی ئایینی سرووشتیی خودێ، هاتن لە پەرستەگەی لالش كۆم بوون، چ بكەن، تا ئێزیدی بێننەوە؟

بە زۆر نابێت، ئاخر لە ئایینێ مە، زۆر و بە زۆرڕاگرتن نینە، هیچیان لە دەستنەهات، هێندە نەبێ، دوو سێ ڕستەیان گۆت و زار لە زاری وەرگرتەوە و گەیشتە هەموو ئێزیدیان:

هەرکەسێ بۆ ئایینی خۆی ئەمەکدار نەبێت، ئەمەکی بۆ ئایینێکیتریش نابێت، هەر ئێزیدییێ لە ئایینی خۆی وەرگەڕێت، گوناهبار دەبێت، جارێکیدی وەرناگیرێتەوە..

دوای بڵاوبوونەوەی ئەو چەند گۆتەیە، ئێزیدی دەستیان بە ئێزیدیی خۆیانەوە گرت و کەسیدی نەبووە زەردەشتی، بەڵام لەگەڵ وان هەر بە تەنیشت یەکەوە ژیان و بێ کێشە و دڵئێشان مانەوە، هەموو پێڕەوی ئەو گۆتەیان دەکرد:

هەر کەس لە سەر دینێ خۆ، ئێوە زەردەشتین، ئێمە ئێزیدین، هەمی ئێك میللەتین.

سێبەرێکی تەنك لە خوێندنەوەی تیشکی سەر بەردی کرد، سەری هەڵبڕی، پۆلێ مەل بە سەریەوە، سەرەو سەری چل مێرا لە باڵیان دەدا، لەوێ وەك ئەوەی باشووکە لێیدابن، بوونە چەند پۆلێ و لێکدابڕان و لە چاو بزربوون.

کەژێی لەو کەژە گەرمە بە کەژ کەوتوو، لە خوێندنەوەی تاشەبەردی چل مێرا کەوت، بەڵام لە لای پیری چل چلە مایەوە،

گەڕایەوە شەوێکی بەفراویی منداڵی، دوایوەی لە دەورکردنەوەی وانەکای بۆوە:

دەی مامۆ، هەقایەتەکێ بو من ڤەگێڕە.

پیری چل چلە، دەستی بە پرچی داهێنا، دەستیپێکرد:

هەبوو نەبوو، کەس ل ئێزد مەزتر نەبوو، هێ لە تاوسی فریشتەش چ کەس لە سەر زەوی نینەرێ وی نەبوو، ئەو ئێزیدیانەی ئایینێ خۆیان هێلا و بە دوای زەردەشت کەوتن و باوەڕیان بە (ئاڤێستا) هێنا، پشتی چەندان ساڵەکی، پەیامبەرێکیدی پەیدا بوو، ناوێ وی مووسا بوو، کتێبی وی (تەورات)ە، هندەك لە زەردەشتیان، ئەو ئایینەشیان بەجێهێشت و بە دوای مووسا کەوتن، ناویان لە خۆ نا:

جوو

بەڵام چ ئێزیدیەك لەگەل مووسا نەچوو، پشتی چەند سالەکیدی، پەیامبەرەکیدی هاتە دنێ، ئەوە (عیسا)یان دەگۆتێ، کتێبی وی (ئینجیلە)ە، دیسان هەندەك زەردەشتی،

ئایینی خۆیان گۆڕی و خاچی عیسایان لە خۆ دا، ئەوانە بە (فەلە) ناویان رۆیشت، بەڵام چ ئێزیدیان بەگەل نەکەوت.

پشتی سەردەمەکی زۆر، ئایینەکیدی لە بەری بیابانەوە هات، پەیامبەری وی ئایینێ، محەمەدی ناو بوو، ئەو گوتبووی: ئەز دوا پەیامبەرێ خودامە، کتێبی مە (قورئان)ە بە هەشت لە دەستێ مەدایە.

+مامۆ، ئەدی مە پەیامبەر و کتێب نینە.

-نا، کچا من، مە تنێ خودێ هەیە، پەیامبەر نینە، پەیوەندی مە لەگەل خودا راستەوخۆیە، پێویستمان بە پەیامبەر نیە، تاوسی فریشتەی خوا، بە راسپاردەی خودا، کاروباری دنیا بەرێوە دەبات. کتێبێ مە لە ناو سینە و دڵدایە، نە لەسەر پەڕە کاخەزان، کتێبێ مە لە سینگمانەوە و زارە و زار هاتووە و دێ و دەڕوا.

مە مەسهەفا رۆژیش هەیە، تە نەبیستیە؟

ئێ، هات، لەشکری ئایینی لە بیابانەوە سەرهەڵداو هات، زمانێ ئەو لەشکرە تیر و شیر بوو، کردنە محەمەدی بە زۆر بوو،

هەر زەردەشتیەك، هەر ئێزیدیەك، هەر.. نەیگۆتبا(ئەشهەد و ئەن لا ئیلا هە ئیلەل لا محەمەد روسووله لا) خوێنی خۆی له سەر خۆی بوو، ئەو لەشکرە ناویان له زەردەشتیان نابوو، ئاگرپەرست، له ئێزیدیانیش شەیتانپەرست..

+ مامۆ، ئەو رۆژە له پۆلیٚ، هەڤالەکی منژی گۆ: هەوە شەیتاپەرستن..

ئەم نە شەیتانپەرستین، نە؟

-نا، کچا من، ئەم ئێزدانی تاك و تەنیا دەپەرستین، ئەوەی:

نە لۆنە، نە رەنگە،

نە ئاوازە نە دەنگە..

له ئایینیٚ مە شتەك نیە ناوی شەیتان بیٚ، ئەو شەیتانەی بە ئێمەیانەوە ناوە، هی سەردەمی لەشکری بیابانە، بۆ رەواییدان بە خوێنڕشتنیٚ میللەتیٚ مە، ئێزیدیان بە شەیتانپەرست و زەردەشتیان بە ئاگرپەرست بە دنیا ناساند.

ئیٚ، گویٚ مەدە ئەو ناو و ناتۆرانە، شەڕەکی گەرم کەوتە ولاتیٚ مە، دوای کوشتوکوشتارەکی زۆر، زۆری هەرە زۆری

زەردەشتیان چوونە سەر ئایینی محەمەد، بەڵام ئێزیدی نەچوونە ژێر بار و بە ئێزیدی مانەوە، ئێرە بەرایی دیرۆکی فەرمان و نەهامەتیی ئێزیدیانە..

+ کچا من، نڤستی؟

-نا..

لە (نا)ی منداڵیی و دیار پیری چل چلەوە، لە چیرۆکەکە ترازا و هەڵفڕی و لە لای خۆی، لە چل مێرا نیشتەوە، بیری وا بە دەوری دەستەواژەی ( بەرایی دیرۆکی فەرمان..)ەوە..

تەنبوور لە بیرکردنەوەی کرد، ئاوازێکی نەرم، نەرم، لە شێوەی داباریینی تنۆکە رۆندك دێتە گوێی، وەك سەردوولکە بۆ شنگالیان بڵێ وایە، دەگۆڕێ، بەرز و نزمدەبێتەوە، لە هەندێ جێ توند دەبێ، لە شەڕ دەچێ، وەك بڵێی تیر و شیر لە یەکتر بسوون، ناوە ناوە خاو دەبێتەوە، شەڕ دەوەستێ، تەنبوور لە گوێی کەژێ، شەڕ و شۆڕە دەگێڕێتەوە، لە بەرایی دیرۆکی فەرمانەوە پێدا دێ، لە دەنگی شمشێر هەڵکێشان و تیر هاوێشتنی لەشکری کوڕی خەتاب و کوڕی غەنەمەوە پێدا دێت،

دەگاتەوە زاری پڕ ژاری سعوودی، لەوێوە بۆ چەتەکانی نادر شا و داود پاشا، هێرشەکانی پاشای کوڕە، بۆ مەلیك غازی لە بەغدایێ، دیٚ دیٚ، وا گەیشتەوە ئەبۆ بەکری بەغدادی..

کەژیٚ دەبیستیٚ، تەنبوور هاتۆتە زمان و بە سیٚ دەنگا گاز دەکات:

فەرمانە، ل مە، ل ئێزیدیخانیٚ فەرمانە

دار وبەردی چیای شنگال هاتنە گۆ:

فەرمانە..

کەژیٚ، لەگەل دەنگی( فەرمانە)ی لە شنگالەوە بەرزبۆوە، هێندە لە خۆی هەڵدا و لەرزی و گەشکە گرتی و کەوت، دوای تاویٚ، بەریدا و هەستایەوە، چەقۆکەی لە دوور کەوتبوو، پڕی دایێ، بەرەو کەپکە شاخەکەی سەریٚ پێی پێوەنا، لەوێوە، چەند جاری بە دەوری خۆیدا سووڕا و دانیشت، گوێڕادێرا، دەنگە دەنگ تەواو نزیبکبووەتەوە، لەو ژاوە ژاوە، هەندیٚ وشەی پچڕپچڕی هەڵهێنجا و (ئە....م....دەر...باز...بووین....لەز....کە) تێگەیشت، بە

زمانی خۆی، بە هی شنگالیان داخڤن، وشەکان روونتر، بوونە رستە و زەلال دەبیسترێن:

وا تێبگەم لێرێهیێ بوو، سەدام حوسێن چل مووشەکێکی بە ئیسرائیلەوە نا..

دەنگێکیتر:

ئێرە، چل مێرایە..

ئەو دەنگەیان لە دەنگی پیری چل چلە دەچیێ، کەژێ زاری کردەوە، بلێ:

مامۆ، ئەز لێرەم.

قووتیدایەوە و نەیگۆ، چاوەڕێ ما، لە چاوەڕوانیدا خەونی دی، نا لە خەون نا، لە دەرێیی خەونیێ گەیشتەوە چارشەمەی سۆر.

## خۆر

### *لە فرەهات خۆی دەشوات*

لە لالشی تیشکاوی، لالشی رۆژ، بەرد هەڵدە، ناکەوێتەوە زەوی، هەر ئێزیدی نا گەلەك موسڵمانیش رژاونەتە شیوی سەراپا کەسك و سپی، سۆر و زەر، هەمی رەنگا، لالشی رەنگ، ئەوەی کەمە شین و رەشە، ئەو رۆژە دەنگی تەنبوور ناپسێتەوە، لالش ئاوازی ژیانە و نابڕێتەوە، کوڕە دەڵێتە کەژیێ:

ئایینیێ هەوە، دەڵێی ئایینی تیشك و رەنگ و ئاوازە.

بە بەژنی کەژێدا دەڕوانیێ و:

وێنەی تۆ سپی و سادەیە

کەژێ دەڵێ:

ئایینێ مە ئایینێ سرووشتیە، جوانە، ئەدی هی وە چیە، سالحۆ؟

سالحۆ بە پێکەنینەوە:

ئایینێ مەژی ئەگەر تیر و شیری تێدا نەبێ، جوانە..

کەژێ کەم جلکی سپیی لەبەردەکرد، بەڵام ئەو چوارشەمەیە، ئاودامان سپیپۆشە، مینا یەکەم بەفری ساڵ کە کلوو کلوو دادەکات، زۆر نابات هەر سێ چیا دادەپۆشێ، ئەو سێ چیایەی پەرستگای لالشیان گرتۆتە باوەشێ، سپی، لالش سپی، وێنەی ئەو دڵەی بەر ئاوی کانیا سپی دەکەوێ، سپی.

سالحۆ ئاهێ هەڵدەکێشێ، توند بە چۆکی خۆیدا دەکێشێ، بە دەنگێکی نەوی، کەژێ بە ئاستم دەیژنەوێ:

لە ئایینی سپیی ئێوە، تەنها یەك گەرد هەیە.

کەژێ زەردەخەنەیەك دەکات :

دەزانم چ دبێژی، نەبێژە.

لەو چارشەمە سۆرە، کەژێ دەیدی، سالحۆ بە شێوەیێ دابونەریتی ئێزیدیانی پیڕەودەکرد، دارودیواری لالشی ماچ دەکرد، بە شێخ ئادیی هەڵدەگۆ، وێردی دەخوێند و لە کانیا سپی دەیخواردەوە، دەتگوت بە ئێزیدیی هاتۆتە دنیایێ، خۆ سمێلیشی سمێڵی پیری چل چلە بوو لە سەر رەشی..

ئەو رۆژە سەریان بە (کانی کیژکا) و (کانی کوڕکا)دا گرت، سالحۆ گۆتیە کەژێ:

ئەز ئەو مۆرکردنەم بە دڵە، تۆیان کەی..

کەژێ:

لە سێ چار سالێ.

هەر ئەو رۆژە بوو، گوناهێکی کرد و سزاکەشی خوارد، لەو بەر بە بناری چیای زهێرادا، بە دەم هەڵگەڕاندا چلەدارێکی شکاندەوە، کەژێ لە دەستی راپسکاند و گوتی:

گوناهت کرد، دەستت بکەوە.

سالحۆ بە گوناهی خۆی زانی، وەك چۆن قوتابیی سەردەمی بەرێ، ناو لەپیان بۆ داری مامۆستا دەکردەوە، بۆ کەژێی

کردەوە، کەژێ لێیخۆش نەبوو، لێیدا و زرچەی هات، سالحۆ دەستەکەیتریشی کردەوە، کەژێ:

دارێك بەسە، جارێکیدی دەست بۆ داری تەڕ نەبەیت، نازانی بڕینەوەی گوناهە؟

سالحۆ:

دەمزانی، بەلاّم لەبیرمنەمابوو.

کەژێ لقە دارە ساواکەی لە تەنیشت دایکیەوە، لە زەوی چەقاند و بە پێکەنینەوە:

ئەگەر بە ئێزیدیش وەرتگرین، تۆ ئێزیدیاتیت پێناکرێ، ئاگاداربە، تف رۆکردنە سەر زەویش گوناهە.

سالحۆ، تفی قووتدایەوە و مندالاّنە فووی لە ناو لەپی خۆی دەکرد، تیچاوێکی دارماڵ لە مەبەستی لە چاوی کەژێ بڕی و گوتی:

ئەدی نالێن لە ئایینی ئێزیدی زەبروزەنگ نینە؟

کەژێ بزەیەکی هێند شیرنی بۆ کرد، خۆی دیتبای، لێوی خۆی ماچ دەکرد، بە شەرمەوە:

بۆ خۆشتڤیان، هەندەك گاڤا، سزا پێتڤیە.

سالحۆ دیسان دەستی کردەوە و گوتی:

سەد داریدیم لێدە.

کەژی دەستی چەپی بە زاریەوە گرت و دەستی راستی بۆ لقی دارەکە راکێشا:

دەتەوێ لە زەوی بکەمەوە و منیش گوناهەکەی تۆ بکەمەوە؟

سالحۆ ئەو جارەش تێکەوت، بەڵام بە سەر خۆی نەهێنا، هەر لە بن ئەو درەختەی لقێکی شکێنرایەوە و لە تەنیشت خۆی نێژرایەوە، لێ کێ دەڵێ، دەروێتەوە؟ جارێکیدی داستانی (کەژێ و سالحۆ)یان بۆ یەکتر گێڕایەوە، ئەوەی لە بەیت و لاوکاندا زارە و زار هاتووە و گەیشتۆتە کەژێ و سالحۆی ئێستا، ئەوەی لە نێوان کەژێی ئێزیدی و سالحۆی موسڵمان، ئەوین هەڵدەکات بە چ ئایین و پەیامبەران رێی پێناگیرێ، سالحۆ دەڵێ:

دیرۆك دووبارە دەبێتەوە

کەژێ باگۆی دەداتەوە:

نەخاسمە بۆ ئێزیدیان، لێ نەترسە، ئێمە بێوەی دلۆپە خوێنێ
بڕژێ، بۆ یەك دەبین.

کەژێ گەیشتەوە ئەو گرتەیەش، کە لە باژێڕێ شنگالێ، لە
پەنایێ کە چ چاوێکی بە سەرەوە نەبوو، سالحۆ دەستی خستە
سەر شانی و لێوی هێنا، بەلاّم ئەو پالێکی پێوەنا و نەیهێشت
لێوەکان بە یەك بگەن.

لەو پالپێوەنانەوە، کەژێ گەیشتەوە سەری چل مێرا، سەری
پەنجەی زێڕنەقووتەی دەستی چەپی بۆ برینی سەر لێوی برد و
دەستی راستیشی بە چەقۆوە بەرز راگرت، بۆڵەیەکی لێوە هات،
توورەگەکەی کردەوە، وێدەچێ نامەکەی بیرکەوتبێتەوە، گەڕا،
مۆبایلەکەی دیتەوە، پەنجەی خستە سەر دوگمەی پێکردنێ:

دەی، بابی نامەیێ، وزە..

نەبوو، ئاهێکی هەڵکێشا:

دوور نیە، نامەکە هی سالحۆ بێ.

دەنگەکان دووردەکەونەوە، نزیکدەبنەوە، هەر دەمەی لە
لایەکەوە دێن، وەك بڵێی بە دەوری کەژێ، بە دەوری چل مێرادا

بسوورێنەوە و هەڵکشێن و داکشێن، دەنگەکان تێکەڵ بە تەنبوور لە شنگالێ دەنگدەدەنەوە، دەیەوێ زار بکاتەوە و پڕ بە هەوکی هاوریکات و بڵێ:

من لێرەم..

دەترسێ و نابێژێ، بەرەو کانیەکە شۆڕدەبێتەوە، سەرهەڵدەبڕێ، رۆژ لە لێژبوونەوەدایە، ورد لێیدەڕوانێ، رەنگوڕووی لەبەر نەماوە، دەڵێی لە ناو خۆڵ و تۆزی بیابانەوە هەڵاتووە، تۆزاویە، دووکەڵاویە، هێدی هێدی بە دیوی فرەهاتدا دادەکشێ، چیرۆکی رۆژ و فرەهاتی بیرکەوتەوە، ئەوەی بە منداڵی لە گۆڤارێکی منداڵانە خوێندبوویەوە:

رۆژیش دژوون دەبێ، ئەو رۆژانەی شەڕوشۆر بەرپا دەبێت و ئاگردەکەوێتەوە و دووکەڵ و تەپوتۆز بە ئاسماندا دەچن، رۆژیش هەست بە پیسی و دژوونی دەکات، بۆیێ بە پەلەپەل خۆ دەگەیەنێتە فرەهات، ئەو فرەهاتەی لە بەهەشتێوە دێ، جوان جوان خۆ دەشوات و سپێدەی دوایی، لە بەری دەچلەوە پاکژ پاکژ وەك چاوی ئێزد دەدرەوشێتەوە و بە سەر شنگالدا هەڵدێتەوە.

دەست و چاوی دەشوات، شتێك دەخوات، دێمکەکە پەردەکاتەوە و تا دەگاتەوە ماڵەکەی خۆی، رۆژ خۆی هەڵداوەتە رووباری بەهەشت، رووباری فرەهات، دەفتەرە گچکەکە دەردەهێنێ، سێ چوار خەتێ دەنووسێتەوە دەیخاتەوە ناو توورەگە

توورەگەکە دەکاتە سەرین و لە کەلێنی لقەکانەوە دەڕوانێتە ئاسمان و چاوەڕێی هەڵاتنی ئەستێران دەکات.

ئەستێرەیێ هەڵدێ، چەند لەوەی سەر لادیوارێکی لالش دەچێ، ئەستێرەکە لە بن هەنجیرەکە هەڵیدەگرێ، دەفڕێ و لە بن درەختێکی لالش لە تەنیشت سالحۆ دەنیشێتەوە:

تۆ ئەستێرە شەش چوکلەی سەر دیوارەکەت دی؟

سالحۆ:

ئەوەی داود دەڵێی؟

کەژێ:

داودی چی! کوڕ و کچەکە دەڵێم

سالحۆ:

ئەستێرەی کچ و کوڕ؟

کەژێ:

ئا، ئەو ئەستێرەیە کچ و کوڕن، باوەشیان بۆ یەکتر کردۆتەوە.

سالحۆ:

ئەو هێمایەم وا نەخوێندبۆوە، کەواتە ئەوە من و تۆین.

تەنبوور لە لالشەوە هێنایەوە بن دارهەنجیرەکەی شنگال، تەنبوور نزیکە، هەستدەکات لە بەری باکوورەوە دێ، ڕەنگە لە بن ئەو سێ چوار بنە دارەوە بێ کە لە سەر ئەوەن تاریکی قووتیان بدات، لەگەڵ تەنبوور چریکەی لاوکبێژێ دێ، لە گوێی کەژێ لە هی سالحۆ دەچێ، هەوە، هەر دەبێ هەو بێ، دەنگی هەسەنە لاوکۆیە، کەژێ دەنگی لاوکێ خۆ دەناسێتەوە، لە ناو گەڕەلاوژان، لە ناو ژاوەژاوان و شاخی هەزار بە هەزاریشدا، چریکەی سالحۆ لە هەر کوێوە هەڵبکات، دەیناسێتەوە.

لاوکی سالحۆ تێکەڵ بە شەمالی چیای شنگالێ و پێلی زێی دەچلەیە، لەبیریناچێتەوە:

لە کەناری زیٚ دانیشتوون، لەو شوێنەی لە باکوورەوە هاژەیەکی نەرمی دیٚ و نەیناوا کەرت دەکات و کەرتی رۆژهەلاتی بۆ کورد دەهێلێتەوە و بەشی رۆژاوای دەبەخشێتە عارەبان، لەویٚ سالحۆ بە دیار پێلی زیٚ و کەزیەوە لاوکی چیایی بۆ کەژیٚ دەچڕیٚ..

کەژیٚ چۆن بیریدەچێتەوە؟ چاودەنیٚ:

لە سەر بانی مالیٚ، لەگەڕەکی منارەی شاکاری شنگالیٚ، چاوی لێیە، کوڕە لاوکەکەی خۆی، پشتی داوەتە منارەی بانگەواز و لاوکەکەی خۆی دەلێتەوە:

ستێرەکەم لیٚ هەلات

ستێرەی بەرایی هێڤاریٚ

شەوقیٚ خۆ دەداتەوە لە چیا، چیاییٚ شنگالی

گەلی برادەرینە

ئەز چاڤی خۆ دەگێرم

جادە ب جادە،کۆلان ب کۆلانی، مال ب مالی

ل منیٚ مال وێرانی، وندا بوویەوە نابینمەوە

بەژەنەکا بلند، گەردنەکا زەر دوو چاڤێن کەژالی

ستێرەك ل من هەلات

ستێرا بەری بەیانی...

کەژێ لە سەر بانێ هاتە خوارێ، لە سەرە کۆلانێ سوورپایەوە..

لە سوورپانەوە، بە ئاگاهاتەوە، لە سەر گابەرد و بن دارهەنجیرەکە خۆی دیتەوە، چەقۆکەی دەستی بە شێوەیێ گرتبوو، زۆری نەمابوو نووکەکەی لە مەمکی چەپی راچێ، سەر هەڵدەبڕێ، ئەستێرەیێ نابینێ، ئاسمانی شنگال لە ئەستێرە رنراوە، دنیا تا دێ تاریکتر دادێ، بە شێوەیەك دەست و پێی خۆی نابینێ، چیا کشومات، نە لاوك، نە تەنبوور، نە هیچ..

هەناسەیەکی نائومێدانەی هەڵکێشا و پاڵکەوت و دەنگی نەما.

## شمشێر بە دەست

### *خۆشەکردن بە خۆڵی بیابان*

لە سێبەری تیشە شاخەکە کە شێوەی سەری ئەسپێکی سەرکێش دەدا، بە تەنیشت یەکەوە دانیشتوون، پاڵکەوتوون، دەڵێی خۆڵ و دۆیان بە سەردا کراوە، لە هەنیەیاندا تووڕەیی دیرۆکێ دەخوێندرێتەوە، کەس سەیری کەس ناکات.

نەما، ئیزیدی نەما

سەری هەڵبڕی، خاوەن دەنگی ناسیەوە، ئاخر ئەو کوڕە گەلەك لە کوڕە لاوکی خۆی دەچوو، بە چاڵی سەر چەنەگەی

ناسیەوە، هەوبوو، ئەو کوڕە بوو، کە کاتیێ، پیری چل چلە دەیگۆ:

فەرمان لە رێیە، دنیا بۆ مە هەر دنیای بەرێیە.

ئەو تیزی پێکرد و گوتی:

دنیا کۆچۆیە.

کوڕە کۆچۆیی بە گریانەوە و پچڕ پچڕ سەربردەی کۆچۆی دەگێڕایەوە:

بەغدادی (نەفرەتی خودیێ لە سەر بی)، گۆ:

بێژنە کۆچۆ، دەست لە خۆ نەدا، نەچیێ بە چ لادا، لە سایەی (دەوڵەتی ئیسلامی لە عێراق و شامیێ) دانیشێت و ئێزیدایەتی خۆی بکات، کەس کاری بەسەریەوە نابێت.

کۆچۆی خۆشباوەڕ، باوەڕی پێکرد و پشتی لێکردەوە، زۆری نەبرد، لەشکر دەوری کۆچۆی دا، ئەز چەند رۆژ بەریێ، بۆ سەردانی خوشکم، لەویێ بووم، لە کۆچۆ.

کەسێك شمشێرە هەڵکێشراوەکەی لێدەرچیێ، هەموو گیانی رەش رەش، لە ئاڵاکەیان رەشتر، بە زمانی قورئان گۆتی:

بە فەرمانی بەغدادی، کۆچۆی شەیتانپەرست، دوو ڕێی لە پێشە و نابێتە سیّ:

یان هاتنە سەر ئاینی موحەمەد، یان مردن و چوونە دۆزەخیّ.

کەسیّ فەرمانەکەی کردە کوردی.

پیریّ، خدری ناو بوو، دەتگوت تازە لە بەهەشتەوە هاتووە، دەستی چەپی بە گۆچانەوە و خۆی پیّڕاگرتبوو، دەستی ڕاستی بۆ ئاسمان هەلّبڕیبوو، دەنگی هەلّبڕی:

ئەم خودای تاك و تەنیا دەپەرستین، شەیتان ناسناکەین، ئەم ئێزیدین و ناچینە سەر چ دیـ...

هێژ نیوەی وشەی (دینا)ی لە ناو زاری بوو، شمشێریّ بەرزبۆوە، دەستی بە ئاسمانداچووی لە سەر شانیەوە پەڕی، لە بەر چاوان، دەستی پەڕیو شێوەی ماری گرت، مارێك خوێنی لێدەچۆڕا، مار، شمشێر بە دەستانی دڕ دا، مار چەند جاریّ بە دەوری پیر خدری لە سەر زەوی کەوتوودا سووڕایەوە، تیژ خشی و ڕۆیی، لە دواوەی ڕێچکەی خوێن سۆردەچۆوە، مار ڕۆیی و

نەوەستا، دیتم، لە سەرە کۆڵانی لاپەڕگەی کۆچۆ، مار لە زەوی بۆوە و بۆوە دەست، مراوی کیوی چۆن پێی لە زەوی دەبێتەوە و بەرزدەبێتەوە، دەستی پیر بەو شێوە باڵی گرت، لەشکری رەش، بەر فیشەکیان دا، بابی شەڕێ فیشەکیان پێوەنا، پێینەکەوت، لە ئاسمانێش خوێنی لێ دەچۆڕایەوە، دەستی پیر سەرەو چیای شنگال هەڵفری و لە چاو ون بوو، ئێستا بگەڕێین دەیبینینەوە، نەڵێن دین بووە، ئی دڵیمە دەستی راستی پیر خدر لە سەر شانیەوە لە چیایە، باوەڕناکەن؟

کەس ورتەی لێوە نەهات، نە بە ئا، نە بە نا.

کوڕە کۆچۆیی دەگێڕێتەوە:

شمشێر بە دەستێ، دەتگوت لە خۆڵی بیابان درووستبووە و خۆشەکراوە، نەڕاندی بە سەر کۆچۆدا:

تا چل دەژمێرم، یان: ئەشهەد و ئەن لا ئیلاهە ئیلە لا، محەمەد رەسوولە لا، یان وەك ئەو شەیتانە پیرە مل پەڕاندن..

کۆچۆ بە یەك دەنگ:

ئەم بەندەی خودێی مەزنین، ئێزیدینە، تا مرن ئێزیدینە.

کەمتر لە چلیان ژمارد، چل سەر پەڕی، لە سێبەری ئالآی ڕەش، ئالآی محەمەد، چل چل سەری مێران دەپەڕین، خوێن هەستا، قیژەو و هاوار گەیشتە ئاسمان و خودێ دانەبەزی، ئەز لەناو گۆمی خوێنێ، لە ناو تەرمان خۆم شاردەوە، چەند تەرمێکی بێ سەرم بە خۆم دادا، لە کەلێنی تەرماندا، چاوم لێیە، کۆمەڵێ ژنیان هێنا رووت رووت، شمشێربەدەستان دەستیان لە سینگ و مەمکیان دەگێران، هیچیانم نەناسیەوە، هەموو بە یەك دەچوون، من ژن بە رووتی ناناسمەوە، تا هەینێش چ ژنێکم بە رووتی نەبینیبوو، نادیەی خوشکمم بە دەنگ ناسیەوە:

خودا، خودای ئاسمانێ، تۆ کە ناتوانی بمانپارێزی لە دەستی ئایینی هۆڤیا، بۆچی بە ئێزیدی ئێمەت هێنایە دنیا؟

لە پڕ دیتم، ژنە رووتەکانی کۆچۆ، بوونە پەلە هەوری سپی سپی، لە بەفری چیای شنگال سپیتر، ژنە هەوریەکان بلّند بوون، بە کەلێنی شمشێری رووتدا بەرزبوونەوە، بە کەلێنی ئەو هەموو پەڕۆکە ڕەشە و (الله و محمد)ەدا بەرزبوونەوە، لەشکری دەوڵەتی

ئیسلامی هەوریان بەر فیشەکان دا، بایەك هەڵیکرد، هەوری برد، بەرەو چیای شنگالی بردن، هەر هەورێکی سپیتان دیت، ئەوە ژنە رووتەکانی ئێزیدیانن..

کۆچۆ نەما، جگە لە من و سێ چوار سەگ و پشیلە، زیندەوەری تێدا نەما، ئەز پێ بە پێ بە رێچکەی خوێنی دەستی پیرخدرا هاتم، ژنەکان لێرەن، خوشکم لێرەیە..

ئا، منداڵەکانی کۆچۆم لەبیر چوو، ئەوانیش لە بن سێبەری (الله) و (محەمەد)دا..

کەژێ بە بیستنەوەی ئەو دوو وشەیە، وەك بڵێی شتێکی بیرکەوتبێتەوە، وەك ئەوەی کەسێ گازیکردبێ، سەری بەرزکردەوە، تاوێ هەستیراگرت و هەستا، چوو بە دیار تاشەبەردێکی روو لە رۆژ دانیشت، گەمەی بە چەقۆکەی دەکرد، چەند کەسێکی بە شنگال کەوتوو بە دوایدا چوون و لە پشتیەوە راوەستان، لە بن لێوانەوە دەڵێن:

ئەو کچە لە سەر تێکچوونە، بەو چەقۆیە شتێ لە خۆی دەکات.

تیشك رژایە سەر بەرد، وشە لە دایكبوو، رستەی بە دوادا هات، كەژێ گەیشتەوە پیری چل چلەش، دەستی بە خوێندنەوە و سەربردەی شنگال كردەوە:

لەشكری ئیسلام، لە بەری دەچلەوە، لە نەیناواوە هات، لەشكر نە سەری دیارە نە بن، هەر بنە دارێكی شنگال تیر بەدەستیێ، شمشێر لە دەستێكی بەردەكەوت، دەمەو ئێوارە بوو، پەیامیێ بە زمانی قورئان گەیشت، شمشیربەدەستیێ خوێندیەوە، تەنها ددانی سپی دەچوونەوە، زەردەشتیەكی تازە موسڵمان بوو، بۆ ئاوایی شنگالی كردە كوردی:

من عەیازی كوڕی غەنەم، سەرلەشكری لەشكری خودا و پەیامبەر، بە فەرمانی عومەری خەلیفەی ئیمامی گەورەی موسڵمانان، بە شەیتانپەرستانی رادەگەیەنم، دوو رێتان لە پێشە:

هاتنە سەر ئایینی موحەمەدەلموستەفا، یان دۆزەخ.

تا سبەینێتان لە پێشە..

ژنێك كە دەتگوت لە بنەچەی تاوسە، بە دەنگێك لە هی قورینگ دەچوو، لە سەر لادیوارێكەوە، هاتە گۆ:

هێی كۆنە زەردەشتی، بێژە كوڕی غەنەم، ئێمە خوداپەرستین، نازانین شەیتان چ شتە، رەنگە ئەو خۆی شەیتان بێت، تۆ، كۆنە زەردەشتیی پێشتریش ئێزیدی، بێژە سەرلەشكری خۆ، ئێمەی ئێزیدی بۆ ئەسكەندەری گەورە سەرمان دانەنواند، خۆ رادەستی تۆ وعومەریش ناكەین، ئەم تا مرن ئێزیدین، دینێ خۆ ناگۆڕین..

ئێزدیخان بە یەك دەنگ:

ئەم تا مرن، ئێزیدین

كەژێ دیرۆكی ئێزیدیانی دەخوێندەوە و دەلەرزی و چەقۆكەشی بەرز راگراتبوو، بە چیاكەوتووان دەوریان داوە، یەك دوانێ دەیانویست داینیشێنن، بە چەقۆ ئاماژەی دووركەوتنەوە دا، دووركەوتنەوە، لە خوێندنەوەی تیشكی سەر تاشەبەردان ناكەوێ:

لەشكرى ئیسلام بە هەردوو بەرى زێى دەچلەدا هەڵكشا، بە وڵات وەربوو، داریان بە سەر بەردەوە نەهێشت، لالشى پیرۆزیان تەخت كرد، هەموو دەڤەرى هەولێرى پەرستگاى عەشتار و جزیرەیان لە خوێن سۆركرد، دروێنەى ژیانیان كرد، مێریان كوشت و ژنى جوانیان برد..

دەورى ئێرە، چیاى شنگالیان گرت، تیرى دنیایان پێوە نا، شنگال بە پشتیوانیى ئەو چل مێرە جەنگا و چۆكى نەدا، هەر مێرەك لەوانە لە زێخى بە چل مێرى ئێزیدیانە، هەر مێرەكى ئێزیدیش بە چل مێرى ئازاى نائێزیدیانە..

كەژێ لە ناو خوێندنەوەى دیرۆكى سەر تاشەبەرد، گۆتەى پیرى چل چلەى پیركەوتەوە، بە دەنگێكى بڵندتر گۆتیەوە:

تاوسى مەلەك چل مێرا بۆ گیانى دوژمن دەنێرێ، پێشانى ئێزیدیانى نادا، بەڵام لە گەرمەى شەڕێ، هەستیان پێدەكات، لە كەوتن و كوشتن و هەڵاتنى دوژمندا هەستدەكات، چل مێرا شان بە شانیان شەڕدەكا..

کەسانی بە چیاکەوتوو، سەرسامانە دەڕواننە کەژێ، زاریان بۆتە تەڵەی تەقیو، کەژێ درێژە بە خوێندنەوەی تیشکی سەر بەردێ دەدات:

لەشکری عەیاز، لە چیا شکا، لە تەشکی خۆی دا و داکشا، لێ دەستبەرداری نابێ، ئاخر جێ و پێدەشت و چیای وایان تەنها لە ناو قورئانێ دیتبوو، ئەو میوەی لە خەونێش نەیاندیتبوو، وا بە سینگ و بەرۆکی شنگالەوە، ئەو هەنجیر و زەیتوونەی خودا سوێندی پێخواردبوون، ئەوەتا بە دامێنی شنگالەوە، رووبارەکەی بەهەشتێش، هەر ئەوەیە وا لە گەلیی کەرسێوە هاژەی دێ ، لە شەڕابەکەش گەڕێ، ئەدی هەنگوینی کۆلکە دارانی بناری چیا؟

ژن، ژن! ژنانی ئێزیدی هەمان ئەو ژنانەی بەهەشتێن کە لە پێناویدا ئەو هەموو بیابان و رێیەیان بڕیبوو، ئەو هەموو گۆمە خوێنەیان رشتبوو..

کوڕە کۆچۆییەکە پێدەچوو لە هەمووان پتر، تێکەڵی دیرۆکی زاری کەژێ بوو بێت، بە خۆی نەوەستا، بە قوڕگی پڕگریانەوە:

ئێ، دوایی، چ بوو، عەیاز شنگالی گرت؟

لەو دەمە، تیشکی رۆژ وا دیار بوو، وەك پێنووسێکی ماندوو، یان مەرکەب تێدا نەماو، تینی نووسینی تێدا نەما، بەڵام پیری چل چلە بە هانای کەژێوە هات، کەژێ گێڕانەوەکەی ئەوی بیرکەوتەوە:

نەگیرا، شنگال بە شەڕ نەگیرا، ئێزیدی وموحەمەدی، رێککەوتن..

کوڕە کۆچۆیی لە سەری خۆی دا:

لە ئایین وەرگەڕان؟

کەژێ، پێنەدەچوو گوێی لە پرسیارەکە بووبێت:

رێککەوتنەکە ئەوهابوو:

بۆئەوەی ئێزیدی لە سەر ئایینی خۆیان بمێننەوە، لە سەریانە ساڵانە باج و سەرانە بدەنە خەلافەتی عومەری کوڕی خەتا..

کەژێ دەنگی (ب)ی وشە (خەتاب)ی گۆ نەکرد، یەکپێ بەرەو ماڵەکەی هەبیەی لێکرد.

هەموو بە دوایدا چوون، ئەو چۆوە بن هەنجیرەکەی خۆی، ئەوانیش یەك یەك، هێندە لە یەکتر دوورنا، لە بن بەردێ، پنچکێ، دارێ، جێیان خۆش کرد، لە بزن رێکتر جێیان خۆشکرد.

کەژێ دیتی پێخەفێك لە جێیەکەی بوو، نەیپرسی هی کێیە، ئەو شەوە سووی ساردبوو، لۆیەکی بە خۆیدا دا، بە دەم خەوە نووتکەوە، گەڕایەوە خەوی دەمەو پایزانەی ماڵێ، ئەو شەوانەی پیری چل چلە، دەهات دەستی بە قژیدا دەهێنا ماچێکی روومەتی دەکرد و دایدەپۆشی و دەیگۆ:

کچم خۆ هەڵنەدەیەوە، سەرمات دەبێ

ئەو شەوە جوان نووست، دەنگی فرۆکە بە ئاگای نەهێنابا، وا زوو رانەدەبوو.

## تەنبوور

## فڕین بە لاوکەوە

ئەو هۆڤیانە فڕۆکەشیان چنگکەوت؟!

هەوکێك بە دەنگێکی پڕ لە ترس وپرس و سەرسوڕمانەوە هەموو نووستوانی بە ئاگاهێنایەوە، لە تەنیشت ماڵی کەژێوە، چەکدارەکە چەکەکەی سوارکرد، کەسێك لە سەرتر:

خۆتان تێکمەدەن، ئەو فڕۆکەیە دۆستە، دوژمن نیە.

چەکدارەکە وا باگۆی دایەوە:

ئێزیدی دۆست نینە.

گریانی منداڵێك و وەڕینی سەگێك  لە نزیك یەکەوە، بە دوای یەکدا هاتن، کەژێ بە واقوڕماویەوە تەماشای کردن، ئێستا زانی  سەگێك و منداڵێکیشیان لەگەڵە، هات منداڵەکە لە باوەش بگرێ، دەنگی تەنبوور وەستاندی، تەنبوور منداڵ و سەگ و فڕۆکەی لەبیربردەوە، ناسیەوە، تەنبوورەکەی عەودالی تەنبوورژەنە  وەك چۆن دەنگ و هەناسەی پیری چل چلە دەناسێتەوە، چۆن چریکەی سالحۆ دەناسێتەوە، ئاواش تەنبووری عەودال لە ناو هەزار تەنبووران دەناسێتەوە، هەر ئەو تەنبوورەیە کە گیانی بە خشیە بابە ئادەم و دایە حەوا، ئەوەی مەلەکی تاوس بە پەنجەکانی خۆی ژەندی.

هەوکە لاوکی سەر تەلی تەنبووریێ، ئەو لاوکەیە کە شنگالی نیە هێندەی ناوی خۆی نەیبیستێ، ئەوەی پشتی  خۆی دەدایە منارەی بانگەواز و روو لە چیا:

هایێ، ل من هایێ..

کەژێ چاو دەگێڕێ و دیار نیە، دەیبستێ و نایبینێ، لەو سەر بەرد بۆ ئەو سەر بەرد، لە شێوەی کەوێ کە بە دوای تاکەکەیدا بگەڕێ، دەگەڕێ، هاواریکرد:

مام عەودال تۆ لە کوێی؟ دەنگت دێ و رەنگت نیە.

چەکدارەکە، بە دوایدا چوو، قۆڵی گرت و هێنایەوە ناو خەڵکەکە، سەربردەی مام عەودالی گێڕایەوە:

لەشکری ئالاّی رەش گەیشت، بە چەکی تازە و کۆن، بە هزری بەرێ، بە هی سەدان ساڵ بەرێ نهۆ، بە شنگالێ وەربوون، ئەو رەشەکوژیەی شنگالی دیتیان، خودا دیتبای، شتەکی دەکرد، ئەو رەشەکوژیەی بە چ لاوکبێژێ ناهێتە ڤەگێڕان..

تۆپەك زوو بۆ ماڵێ مە هات، ماڵمان روو لە منارە بوو، ئەز لە قاتێ سەرێ بووم، بانی خانیێ مە تەپی، ئەز کەوتمە بن پارچە ساپیتەیێکی دارماو، باش بوو لا دیواری رووخاو گرتیانەوە و نەیانهێشت ئەز بفلیقێمەوە، بە چ جێم نەکەوت، ئێشم نەگەیشتێ، لە بن دار و بەردەوە کەلێنێکم دیتەوە، بە خۆ باریککردنەوە پیوەدەهاتم، سەرم دەرهێنا، لە ناو تۆز و خۆڵێوە،

عەودالی تەنبوورژەنم ناسیەوە، دیتم، پشتی داوەتە منارەی شاکار، منارەی بانگەواز، پێ لە سەر پێ تەنبوور دەژەنێ، لەو خەرابوونەی شنگال ئەو مێش مێوانی نیە و تەنبوور دەژەنێ، بە ئاستەم دەنگی تەنبوورم دەبیست، لە دڵێ خۆ گۆتم:

بە خودێ یان دین بووی، یان رۆژت هاتووە!

قسەکەم راست دەرچوو، لە هیکەوە شەش حەفت زەلامی کەتەی چەك لە شانی شمشێر لە دەست، گەیشتنە سەری، عەودال خۆی لە گوورە نەبرد، تەنبووری خۆی دەژەند، شمشێربەدەستێ بە دەنگێکی بیابانی بە زمانی خۆیان گۆتی:

ئەو شەیتانپەرستە، مۆسیقا بۆ شەیتان لێدەدا.

عەودالی تەنبوورژەن، پتر دەنگی تەنبووری هەڵبڕی، وای! شمشێرێ لە سەر سەری عەودال بەرزبۆوە، بریسکەی شمشێرم دی، لە چاوترووکانێ، شمشێر داهاتەوە، چیم دی، چیم دی! ئەوەی من دیم، تەنها ئاڵاڕەشان بیبینن، دەستی عەودالی تەنبوورژەن لە سەر ئانیشکیەوە پەڕی، چاوم نووقاند و کردمەوە، دیتم لە بڵندایی دوو بەژن بڵندتر بە منارە کەوت، منارە مۆری خوێنی

گرت، باوەڕم بە گوێی خۆم نەکرد، دوای پەڕینی دەستیش تەنبوور لە لاوك نەکەوت، لە جاران دەنگی زەلالتر دەهات.

پاش کەمێ، شمشێرێکیتر بەرزبۆوە، لەوی پێشتر پتر بریسکەی دا، داهاتەوە، دەستەکەیدیی عەودالی لە سەر شانەوە پەڕاند، نەمدی لە کوێ کەوتەوە، ئەها، تەنبوورە وا لە سەر سینگی عەوداڵە، هێشتا لاوکان دەڵێ، پەنجەم لە گوێی خۆم وەردا، پێموابوو گوێم دەزرینگێتەوە، نا دەنگی تەنبووری عەوداڵە و بێ دەست و پەنجە لاوکی خۆی دەڵێتەوە، هایێ هایێ دەڵێتەوە..

نەڵێن تێکچووە، نەڵێن خەونی دیتووە، ئەوەی دەیگێڕمەوە، بە بەرچاومەوە، لە بن منارەی بانگەواز روویدا، بەو چاوانەی خۆم دیتم، دوو شمشێر، دوو شمشێری وا، لە شاخی هەڵبکێشی دەکشێتەوە، لە ساتی دانەوینەوە، تەنبوور دەرپەڕی، عەودالی تەنبوورژەن بووە چەند کەرتێ، لایەکی منارە بە خوێن سواخدرا، تەنبوور فڕی، لە شێوەی قورینگ فڕی، لەشکری ئیسلام،

تەنبووریان بەر فیشکان دا، تەنبوور فڕی، بەرەو چیای شنگال فڕی و گوللە نەیگەیشتیێ.

رووی لە کەژیێ کرد:

تەنبوورەکەی عەودال لێرەیە، دڵنیام لێرەیە، ئەوەی تۆ دەیبیستی تەنبوورەکەیە، بەڵام بۆچی من نایبیستم؟

کەژیێ، وەك بڵێی لەگەڵ ئەویشیان نەبێ، بە کەرتە پەیڤێکیش زاری هەڵنەهێنا، هەستی راگرتبوو تا پێبکەویێ تەنبوورە فڕیوەکەی عەودال لە کیهە لاوەوە لاوکان دەبێژیێ.

لە بەری شارەوە دەنگی تەقینەوە دیێ، زرمەی گەورە، وەك بڵێی ئەشکەفتان بتەقێننەوە، هەرچی دەنگە، چ لە ئاسمانی چ لە زەوی بڕان و لە تەقینەوەی شاردا توانەوە، کوڕە کۆچۆیی دەڵیێ:

رەنگە شار بتەقێننەوە

چەکدارەکە:

من شتێ لە دیرۆکی ئەوانە بزانم، منارەکەش دەتەقێننەوە، ئەوەی شتێ لە دیرۆك بزانێ، دەزانێ ئەوانە نەوەی چ زۆردارێك و دژە شنگالێکن.

کەس هێزی ئاخافتن و گوێڕاگرتنی نیە، ئەوەی هەیە کوڕە کۆچۆیی و چەکدارەکەیە، جار وبار بابەت دەکەنەوە و چیرۆکی کۆچۆ، هی شنگال، هی رێ دەگێڕنەوە، هەر زووش، لە زاری کۆچۆییەوە، چەکدارەکەی نازناوی دیرۆکزانی بە سەردا بڕا و لەویشەوە زارەکانیدیشی گرتەوە.

کەژێش تەنها بە دیار تیشکی سەر تاشەبەردانەوە، زمانی دەبێتەوە.

دەنگی تەقینەوە نەما، کەژێ هەستا، وێدەچوو نیازی دیار تاشەبەردەکانی دیوی رۆژێی هەبێ، لەو دەمە کوڕە کۆچۆیی دەستی بە گێڕانەوەی سەربردەی دەربازبوونی خۆی کرد، کەژێ لە جێی خۆی دانیشت و چاوی لە چەقۆکەی دەستی بڕی، کوڕە کۆچۆیی تیچاوێکی لە سەر کەژێیە و زاری هەڵێنا:

دوایوەی کچ و ژنەکانی کۆچۆ بوونە هەور و گەیشتنە سەری شنگال، هەستمکرد لەشکری ئالآرەشی ئەللا و محەمەد لە سەر، لەو ناوە دوورکەوتوونەتەوە، بە چ حاڵ لە بن تەرمان هاتمە دەرێ، لەشم هەموو خوێنە، وەك ئەوەی لە ناو گۆمی خوێن مەلەم کردبێت، وابوو، بە سەر سەرە پەڕیوەکاندا کە هەندێکیان هێشتا خوێنی گەرمیان لە بەر دەڕۆیی، بازمدەدا، نەمدەزانی روو لە کوێ بکەم، نەمدەزانی شمشێربەدەستەکانی ئیسلام لە کوێن، لە دەرگایەکی شکاوەوە چوومە ژوورێ، نازانم چۆن بوو، بیری خۆ شووشتنم بە بیردا هات، لە سەر جلکەوە سۆندەی ئاوێم لە سەر سەرم راگرت، وا تێبگەم سابوونیشم لە خۆم دا.

هەر لەو ماڵە، بیرمنایەتەوە ماڵی کێ بوو، ئەها ئەو جۆرکەم دیتەوە، گەرام، نان و هەندێ پێخورم دیتەوە جۆرکم پڕکرد، بەرە بەری رۆژاوا، سێ چوار مریشك بە حەوشە کەوتن، لە لای بەلووعەی ئاوێ راوەستان و سەرسامانە دەیانڕوانی، دەتگوت هەستیان کردووە رووداوێ روویداوە، رەنگە چاوەڕێی ژنێکیان کردبێت، تا (تی تی تی)یان بۆ بکەت، نازانم ئەو

مریشکانە چۆن دەستی تالأن نەیانگەیشتنێ، ئەنگۆ دەزانن، سێ لای کۆچۆ عارەبە، زۆر لەوانە بەگەڵ لەشەکری رەش کەوتن و کۆچۆیان ئەنفالکرد، کەوتنە تالأنوبڕۆ.

ئێ، دنیا لە سەر تاریکبوونە، دەنگە دەنگ دێ، روون نیە دەنگی کۆچۆیین یان لەشکری شەڕ، سەرێکم بە کۆلأندا داگرت، چۆلە، پاش کەمێ بڕیارمدا بێمە دەرێ و روو لە چۆلەوانی، روو لە چیا بکەم، هاتم، لە سەرە کۆلأنێ، چەك لە دەستێ لە پێشم قیت بۆوە، دەستی بۆ چەکەکەی برد، من لەو بەدەستوبردتر بووم، مستێکم خێواندە بن گوێی، ئێخستم، ئاخر وەرزشکردن و بۆ دەمێکی وا باشە، کەوتمە سەری، تەختی زەوم کرد، ئەو مەتارەیە هی ئەوە، تفەنگەکەم هەڵگرت، لەو دەمەوە دوو سێ تارماییم دیت بەرە و من دێن، ناسیمنەوە ئەوانیش لەوانن، تفەنگم راکێشا، پلم پێوەنا، نەتەقی، نەمزانی چۆن سواردەکرێ و فیشەکی دەخرێتە بەرێ، لەوێ ئامۆژگاریی پیرەکەی بن منارەی شنگالێم بیرکەوتەوە، ئەوەی دەیگۆ:

ئیزیدی پێویستە راهێنانی چەك بکەن، فەرمان لە رێیە.

لەو دەمە کەڕێ ڕاچڵەکی، ویستی زاری هەڵبێنێ و شتێ بڵێ، قوتیدایەوە، کوڕە کۆچۆیی لە سەری ڕۆیشت:

تەقەیان کرد، بە ڕێکەوت بەرنەکەوتم، چەکم فڕێدا و بە جۆڕك و مەتارەوە هەڵاتم، نازانم، چۆن دەرچووم و چ ڕێیکەم گرت، لە ڕێیێ هەستمکرد کەسێکم لەگەڵە، دیتم سەگێ لە شانم پێ بە پێی من غاردەدا، پاش کەمێ پێشم کەوت، هەستمکرد پێمدەڵێ:

بە دوامدا وەرە.

بە قسەم کرد و لە دوای نەبوومەوە، نازانم بە کوێدا منی گەیاندە ئێرە، ئەو چاوساغە، ئەو سە سپیە نەبا، داخوا لە کوێ دەکەوتمە دەستی ئالاڕەشان، یەکەم جارمە بێمە سەری شنگالێ..

کوڕە کۆچۆیی، تیچاوێکی دایە چەکی دەستی دیرۆکزان، هەناسەیەکی هێند ساردی هەڵکێشا، شنگالی لە بن دەهێنا، بە دەنگێکی نزم:

ئەگەر بە قسەی پیری چل چلەیان کردبا، ئێزیدی بۆ وایان بە سەردەهات..

دیرۆکزانی چەك لە دەست هەڵیدایێ:

من زوو لەو تێگەیشتم و بە قسەم کرد.

کەژێ، زاری کردەوە، دەنگیشی لێوە هات، گێڕایەوە، دیرۆکزانی چەك لە دەست گەڕایەوە بن ساپیتە رووخاوەکە و لەوێوە، لە خەونەکەی پێش هاتنی لەشکری رەشەوە پێدا هاتەوە:

خەونی من ئێکاوئێکە، لەو خەونە ئەز چەندان پشت گەرابوومەوە دواوە، لە بناری چیای شنگالێ بارەك ئاوریشمم بارکردبوو، لە پڕ کەوتمە ناو لەشکری ئۆسمانی، کابرایەکیان دەفتەرەکی بە دەستەوە بوو، بە زمانی خۆیان، قسەکی کرد، سەری تێنەگەیشتنم بادا، کەسەکیان گازکرد، کردیە کوردی و گۆتی:

ئەوە رێزدار ئەولیای چەلەبیە، دەپرسێ:

هێی شەیتانپەرست، ئەو چیە بارتکردووە؟

ئەزژی باگۆمداوە:

ئەز نە شەیتان پەرستم.

+تو ئێزیدی نی؟

-بەلێ ئێزیدی کوڕێ ئێزیدیمە.

+ ما چ دەپەرستی؟

-خودێی عەرد و عاسمانا؟

ئەولیا بزەیەکی تاڵی کرد و گۆت:

+ئەوە چ شتە بارتکردووە؟

_ئاوریشمە

+ دەیبەیە کوێ؟

-باژێرێ نەیناوا و دەیفرۆشم

جەندرمە دەوریان دام و هێستریان بە ئاوریشمەوە برد و منیشیان هەڵدایە هەڵدێرێ، نازانم خۆم پێگیرایەوە یان نا، بە ئاگاهاتمەوە..

رووی لەکوڕە کۆچۆیی کرد:

+تۆ ئەولیای چەلەبی دەناسیت؟

-ناوم نەبیستووە.

کەژێ، لە رووخساری دەرکەوت ئەو کابرایە دەناسێت و ویستیشی شتێ بلێ، نەیگۆت.

دیرۆکزان :

ئەو ئەولیای چەلەبیە، تورکە ئۆسمانیە، بەری سێ سەد چار سەد ساڵ هاتۆتە چیای شنگالێ، بەری کەزی درێژا، کتێبێکی هەیە ناوی (سیاحەتنامە)یە من خوێندوومەتەوە، لەو کتێبە ئێزیدی بە شەیتانپەرست و پیس و زیادەی سەر زەوی دادەنێ دەلێ:

((ددانی ئێزیدیان بە قەد ددانی ئەسپە، زاریان لنگە پێلاوی پێوەدەچێ، منداڵەکانیان بە شیری سەگ گەورەدەکەن..

چیای سن جار، زۆر پیرۆزە بەلاَم ئەو ئێزیدیە بێ دینانە گلاویان کردووە

خوێنی ئێزیدی (حەلاڵ)ە))

ئەولیای ئۆسمانی، ئەولیای موسڵمان ئەوها دەلێ.

دیرۆکزان، تفێك بۆ ئەولیا و نامەکەی دەنێرێ و دەلێ:

ئومێد دەکەم چ ئێزیدیەك خەون بەو چەلەبیە ئۆسمانیە خوانەناسەوە نەبینیٚ.

هەستدەکات کچە و ئەوانیدی گوێیان لێراگرتووە، داو دەداتە پووشکاخەزی گێڕانەوە:

بەر لە خەونەکەش، باوەڕم بە قسەکانی پیری چل چلە هێنابوو، دەمزانی ئەو لە کوێوە قسان دەکات، من شتێك لەو فەرمانانەم دەزانی کە لە دیرۆکدا بۆ قڕانی ئێزیدی دەرچووبوون، قسەیەکی پیری چل چلەم لە پشت سەرم لە دیواریٚ هەڵکۆڵیبوو:

لەو دنیایە، تا رۆم و عەجەم و عارەب، تا کوردی کرێگرتە، تا ئیسلام مابیٚ، فەرمان بنی نایە.

بە تۆپەکەی ئەو رۆژە دیوارەکە رووخا، بەڵام نووسینەکە دەمێنێتەوە، رەشنابێتەوە، لە دیوارێکیتر دەینووسمەوە.

دوای ئەو خەونەی بە ئەولیای چەلەبیمەوە دیت و بارە ئاوریشمەکیان بردم و هەڵدێرام، یەکسەر بارم کرد، بڕۆ بڕۆ، ماڵم بردە هەولێریٚ، ئێستا ژن و دوو منداڵەکەم لەوێن، بەر

لەوەی بگەمە چیا، قسەم لەگەڵ کردن، لە رێیی مۆبایلکەم کەوت و هەر پارچەی چووە جێیی.

کورە کۆچۆیی:

نەشکاباش هەر شکا بوو، تا دەگەیشتیە ئێرە وزەی تێدا نەدەما

دیرۆکزان لە گێرانەوە ناکەوێت:

دوو رۆژ بوو، گەڕابوومەوە شنگالێ، پیری چل چلەم لە بن منارەی شاکاری شار، لە کن عەودالی تەنبوورژەن دیتەوە، گۆتی:

ئەو خەڵکە گەلەك بێ مێشکن، قسەی منیان بە گوێدا ناچێ، کچەکەی خۆشم بە قسەم ناکات.

ئەو تاقە کچێکی هەبوو، نازانم بە خۆ و کچەوە گەیشتنە کوێ.

کەژێ نیگایەکی لێکرد و هیچی نەگۆت.

ئەو هەستی بەو نیگایە نەکرد و چووە دووی:

منیش وا چاوەڕێم نەدەکرد، پێشمەرگە بێ تەقە بقووچێنن، هێژ گوللەی ئاڵاڕەشان، هی داعشان، نەخشی منارەی دیرۆکیی شنگالێ نەقرنجاندبوو، شووشەی چ پەنجەرانی نەشکاندبوو، نەکەوتبووە سەر چ سەر بان و ناو حەوشان، فەرماندەی پێشمەرگە، ئێزیدیی هێلابوو، لەوبەری پردی سێهێلا بوو، چ بزانم سێ مەحموود ئێزیدیان تێدا نیە، تا بەر سینگێ دوژمن بگرن، تا پێ بچەقێنن و بە پێوە بمرن، بە بەر چاومەوە باریکەیان دایێ و هەڵاتن، چەندی گۆتم:

شەرمە، شنگال بۆ گورگان بەجێدێلن، ئاوڕیان نەدایەوە، یەکیان لە پشتی ترومبێلەوە، بە گریانەوە، ئەو فیشەکدانەی بۆ هەڵدام.

شنگال چەند تەنیا بوو، لە خودا تەنیاتر، تەنیا تەنیا، ئەو ڕۆژە سەر بە چ ولاتێ نەبوو، کەس بە هاواریەوە نەهات، نە عێراق فڕۆکەیەکی بۆ هەستاند، نە کوردستان دوو فیشەکی بۆ تەقاند.

ئەز چەندی کردم ڕێم دانەگرت، خۆم لە شنگالییان جیابکەمەوە، مامەوە، ئەوە بوو خانووم بە سەردا رووخا و پارچە پارچە بوونی عەودالی تەمبوورژەن و فڕینی تەنبووم دی.

چیم نەدی، ئەوەی بە سەر شنگالدا هات، نزابکەن بە سەر بەغدا، بە سەر مەکە و مەدینەشدا نەیێ، هەرچی مێری ئێزیدی هەبوو کوشتیان، هەرچی ژنك و زارۆی ئێزیدی هەبوو بردیان..

شنگال، شنگال

پڕ بە دەنگ هاواری کردە شنگال، کەمێ وەستا و تێهەڵچۆوە:

لە تاریکیدا، دەرفەتێکم قۆستەوە، بە کەلێنی پەڕۆڕەشان، بە بن (الله) و (محەمد)ا هەڵاتم، کەوتمە بن دەستڕێژی گوللە، چەکم پێنەبا، تیاچووبووم، دەستمکردەوە، سێ چوارێکم لێیان ناردە دۆزەخێ، هەڵاتم، لە سەر سیلەیێ لە بەر رووناکایی گلۆپ بوو یان مانگەشەو، محەمەدم ناسیەوە، گوللەیەکم پێوەنا، ڕێك بە چەنەگەی کەوت، وەی بابەڕۆیەکی لێ بەرزبۆوە لە منارەی بانگەواز دەنگی دایەوە، بە رۆژیش ئەو کوڕەم دیتبوو، بووبووە

کەوا سووری لەشکری دەوڵەتی ئیسلامی، چاوساغیی بۆ دەکردن، ئەو محەمەدە هاوڕێم بوو، کریڤایەتیمان لە نێوان بوو، شکاندی، ئەو نارەسەنە پەیمانی شکاند، لە هەر شوێنێ کەسێکی بێ گەردنتان دیت، ئەوە محەمەدە و بە گوللەی من گەردنی پەڕیوە.

ئیدی هاتم، لە بناری چیا، لە پاڵ بەردێ ئەو منداڵەم دیتەوە، دەتگوت گوڵە شلێرەیە ملی لارکردبۆوە، دیار بوو بە جێمابوو، خەڵکێکی زۆر بە چیا کەوتبوون، لە باوەشم کرد و بەرێی تەنبوورەکەی مام عەودالدا، بە چیادا هەڵگەڕام، ناوی خۆی نەگۆ، لۆیێ ناوم ناوە گوڵەشلێرە.

کەژێ بە بیستنی محەمەد، رەنگی تێکچوو، هەستا، لە بەر خۆیەوە دەیگوت:

گیانگۆڕکێیە، گیانی محەمەد هاتۆتە گیانی محەمەد.

هەموو بە گوڵەشلێرە و سەگە چاوساغەکەشەوە، بە دوایدا چوون، گەیشتە بن داربەڕووەکە، ئەوەی بەرانبەر تیشە و تاشە بەردەکان، کەژێ چاوێکی بە خەڵکەکەدا گێڕا، پێدەچوو

بیانژمێرێ، کوڕە کۆچۆیی، کە لەو ساتە دەستی منداڵەکەی لە دەست بوو، گوتی:

تەواوین، بە گوڵەشلێرە و سە سپییەوە نەهێن.

کەژێ گوێی بە قسەی کۆچۆیی نەدا، تێر چاوی پێداگێڕان و پەنجەیەکی گەیاندە برینی لێوی و سەیرێکی چەقۆکەی کرد و چاوی بڕیە تاشەبەردان.

*لێرەوە*

***نیوەی دنیا***

خامەی خۆر گەیشتە سەر تاشە بەرد و نووسی، خۆر نووسیی و کەژیٚ خوێندیەوە، یان بڵێین گێڕانەوەی پیری چل چلەی بە دەنگێکی تۆزیٚ نزم، بۆ خۆی خوێندەوە و بە چیاکەوتووانیش هەناسەیان لە خۆیان بڕی:

موعتەسەم بیلای عەباسیی خەلەیفەی موسڵمانان، لە سەر خواستی دایکە تورکەکەی، پایتەختی گواستەوە، بەغدای هێنایە سامەرا، لەو سەروبەندەش، باج و سەرانە لە سەر

ئێزیدیان  بە شێوەیەك زیاد كرا لە بنی هەڵنەدەستان، بۆیە میری ئێزیدیان گۆتە خەلیفەی موسڵمانان:

ئەو سەرانە زۆرە، بە میللەتی ئێزیدی لە بنی دەرنایێ.

خەلیفە یەكسەر فەرمانی دا:

خوێنی ئێزیدیی شەیتانپەرستان، بۆ موسلمانان حەڵاڵە.

لەشكری عەباسی هێرشی هێنا، ئێزیدی بەرگریان كرد، لە بن ئالای فەرگەسی ئێزیدی شۆڕش بەرپابوو، هەرچی هێزی عەباسی هەبوو هاتنە سەر ئێزیدیخانێ، شەڕ درێژەی كێشا، عەباسی هێرشیان دەهێنا و دەشكان، تەرمی خۆیان لە ناو زێی دەچلە دەدیتەوە، ئەو شۆڕشە دوو ساڵێ درێژەی كێشا، ئێزیدی نەشكان، سامەڕا ترسی لێ نیشت، تێگەیشتن لەگەڵ فەرگەس شەڕ بەلاشە، سەریان تێدا مابوو.

لەو تەنگانەیەی عەباسیان، كوردەكی موسڵمان، ناوێ وی (محەمەدی موسافیر) بوو، بە هانایانەوە چوو، پلانیان داڕشت.

محەمەدی موسلمان و و فەرگەسی ئێزیدی كریڤاتیان لە نێوان هەبوو، برای خوێن بوون، بە سەر یەكتر سوێندیان دەخوارد، بۆیە

فەرگەس لە سەر قسەی وی رازی بوو، بچێت لەگەڵ سەرلەشکری عەباسیان دانیشێ، تا بگەنە رێکەوتنێ و چیدی خوێنی ئێزیدی و موسلمانان نەڕژێ.

فەرگەس گۆتە محەمەد:

کریڤۆ، من باوەڕ بە عەباسیان نیە، لێ باوەڕی تەواوم بە تۆ هەیە.

محەمەد گۆت:

کریڤۆ، ئێمە برای خوێنین، پشتت لە عەرد نادەم و ئامادەم خۆمت لە سەر دانێم.

لە نەیناوا، لە رۆخ زێ، لەگەڵ سەرلەشکری دوژمن دانیشتن، ناوی ئیتاخ بوو، بە دەم خواردن و خواردنەوەوە کەوتنە گفتوگۆ، بە دەم قسەکردنەوە، فەرگیس و ئەو سوارانەی لەگەلی بوون، لاربوونەوە.

ژەهرەکەی محەمەدی موسافیر زۆر کوشندە بوو، بە قەد ژەهری سەد ماری ژەهردار کوشندە بوو.

ئەوە بەرایی ناپاکیی کوردی موسڵمانە لە هاوزمانی خۆی، بە مردنی فەرگیس و هاوڕێکانی، لەشکری ئێزیدی بێهێز بوو، پەرتەوازە بوو، لەشەکری عەباسی پێوەر بوو، دوای چەندان شەڕی سەخت و دژوار، ئێزیدی شکان، ئیسلام دەڤەری ئێزیدیان و چیای شنگالی لە ئێزیدیان دووریەوە، هەر بنە دارێك، هەر بەردێکت دەدی، خوێنی ئێزیدیی پێوە بوو، ئەوەی بەردەستکەوت کوژرا، ژن و کچی جوانیشان لەگەڵ خۆیان برد، پایز بە سەر ئێزیدیان داهات و هەڵوەرین.

بەڵام زۆری نەبرد، چیای شنگال وەك چۆن هەموو سەری بوهاران، گوڵ و پەلکان دەگرێتەوە و کەسك دەچێتەوە، ئاواش ئێزیدیی لێ پەیدادەبێتەوە، ئاخر شنگال بێ ئێزیدی نابێت.

دیرۆکزان بە هەوکی نووساوەوە:

محەمەد لە ئێمە نابڕێ، دوایان بڕێ

کەژێ وەك کەسێ لە دوورەوە گازیکردبێ، یان شتێکی بیرکەوتبێتەوە، پەنجەی بۆ لای لاچاوی بەرزکردەوە، هەستی

راگرت، یەکپێ بەرەو کانیەکە، چەقۆکەشی رادەشەقاند، کۆچۆیی بە دەنگێك کە هەموویان گوێیان لێبوو:

ئەو کچە، تێکچووە، شتێ لە خۆی نەکات باشە.

دیرۆکزان:

ئەوەی ئەو کچە دەیڵێ، خڕی راستە، من ئەو دیرۆکەم خوێندۆتەوە و بیستوومە، ئەو کچە دیرۆکی ئێزیدیان دەگێڕێتەوە، بەلاّم تێناگەم بۆ تا نەیەتە ئێرە و تەماشای ئەو بەردانە نەکات، ورتەی لێوە نایەت؟

کوڕە کۆچۆیی:

ئێ، ئەوە نیشانەی دینبوونە.

دیرۆکزانی چەك لە دەست:

نا، دین نیە، شتێ هەیە، ئێمە تێیناگەین.

بە دوای کچەدا چوون، لە دەو کانی دانیشتن و توورەگە و جانتایان کردەوە و شتێکیان خوارد، کەژێ هەردوو پێ و دەستێکی خستۆتە ناو ئاوەوە و چەقۆکەی دوور لە ئاو راگرتووە.

هەموو چاویان لە سەر چەقۆکەیە و کەس زاخ ناکات بپرسی:

سەربردەی ئەو چەقۆیە چیە؟ بۆچی لە دەستت نابێتەوە؟

پرسین بەلاشە، قسە بە فیڕۆدانە، دەزانن وەلاّمناداتەوە، تا نەچێتە دیار بەردەکان و نەخوێنێتەوە، لە سەری دەی ڕستەیەکی لە زار دەرنایە.

هەموو چاویان لە سەر کچەیە، چەندی لە سیمای ورددەبنەوە، کەس نایناسیّ، تا ئێستاش ناوی نازانن، کەس پێیوانیە پێشتریّ دیتبێتی، تەنها دیرۆکزان لە بن لێوانەوە دەلّیّ:

من وێنای دەکەم، هەستدەکەم ئەو کچە کەزی زەرەم دیوە، بیرمناکەوێتەوە لە کویّ.

هەر لە زاری دیرۆکزانیشەوە، کەزی زەر بە سەر ئەو کچە نەناسراوەدا بڕا و لە نێوان خۆیان بە ناوە ناویان دەهێنا.

گرموهۆڕە، دوورە، هەموو روو لە ئاسمانن، وەك بلّێی چاوەڕێی دابەزینی فریادرەسیّ بن، چاوەڕێی هاتنی تاوسی مەلەك بن..

وەها چوونەتە بیرکردنەوە، کەس لە سەر کانی و شنگال نەماوە، هەر کەسە و چۆتەوە بەر بە چیاکەوتن، گەیشتوونەتەوە ساتی دەربازبوون، پیش دەربازبوون و پێش تەقە و گەیشتنی شمشێر، گەیشتوونەتەوە ناو هاوار و قیژەی کەسوکار، رفاندن و خوێنڕشتن، گوڵەشلێرەش کە وێدەچێ سێ ساڵانە بێ، ئەویش رۆیشتووە، سە سپیش، سەی چاوساغ رەنگە تەنها کلك جوولانەکەی بە چیای شنگالەوە مابێ، لە چاویانڕا دیارە، گەڕاونەتەوە ناو گەرمەی فەرمان، ئەوەتا جاروبار موچڕکیان بە لەشدا دێ، ئەوە لە خۆوە نیە، بیرکەوتنەوەی خوێن و قیژەیە، ئەها لە بن لێوانەوە شتێ دەڵێن، هەر خۆیان دەیبیستن و تێیدەگەن، ئەو بە چیاکەوتووانە، سەربردەی خۆیان، لە دەستدانی کەسوکار، بۆ خۆیان، بە بێدەنگی دەگێڕنەوە، زۆر کەم نەبێ، کەس توانای گوێگرتنی چیرۆکی ئەویتری نیە، هەر کەسە و بە سەر کۆستی خۆیدا کەوتووە، بۆیە ئەگەر کوو، کەس بۆ کەس ناگێڕێتەوە، تەنها کاتێ کەزی زەر بەرد دەخوێنێتەوە،

هەستی لێڕادەگرن، ئەوەش پتر زگ پێسووتانە، زۆریان جگە لە دیرۆکزان، پێیان وایە، دین بووە، یان لە لێواری دینبوونە.

دیرۆکزان لە کەژێ، خۆی گۆتەنی کەزی سەر، نزیکدەبێتەوە، چاو دەخاتە سەر چەقۆکەی دەستی و دەڵێ:

وا تێبگەم ئەو چەقۆ بە خوێنە، خوێنی تۆڵەیە، دەی سەربردەکەی بگێڕەوە.

کەژێ پێناچێ لە چیای شنگال مابێ، ئەوەی لە سەر کانیەکە دانیشتووە، تەنها وێنەیەکی جەستەی کەژێیە، دوور رۆیشتووە، هێند دوور بە چ پرسیاران نایەتەوە و ناگاتەوە ناو مێرانی بە چیا کەوتوو.

دیرۆکزان:

کچەکەم، من وێنای تۆ دەکەم، تۆم لە شوێنێ دیوە، بیرمناکەوێتەوە بڵێ، خەڵکی ناو شنگالی؟ کچی کێی؟ دە تیچاوێکم بدێ، بزانە نامناسی؟

کەژێ لێرە نەماوە، تا ئاوڕی لێبداتەوە.

دیرۆکزان:

تۆ لە دیرۆکی شنگال و ئێزیدیان لە من شارەزاتری، ئەوانەی تۆ دەیخوێنیتەوە، هەموو راستن، تا چەندت خوێندووە؟ چ بەشکێت تەواوکردووە؟

کەژێ گوێی لێنیە، لێرە نیە، تا بەرسڤی پرسیاران بداتەوە.

گرمەیەك هەمووانی راچڵەکاند، تەنها ئەو پیاوە نەبێت کە لەو هەشت سمێلانەی ناو (سیاحەتنامە) دەچێ، ئەوەی سەدان ساڵ بەرێ نهۆ، لە شنگالێ دیتبوونی، گرمەکە شنگالی هەژاند، دار و بەردی لەراندەوە و باڵداری هەڵفڕاند، گوڵەشلێرە زیڕاندی خۆی بە باوەشی ئەوەی تەنیشتیدا دادا، سە سپی قوڕاندی و کلکی خستە ناو گەلێ...

کەژێ بەر لە هەمووان هەستاوە پێ و یەکپێ بەرەو بلندایی چل مێرا، یەك یەك بە دوای ویدا رێچکەیان بەست، گەیشتنەوە قەد پاڵی لووتکەی گومبەتی، کەژێ سەرکەوتە سەر بەردەکەی خۆی و لە بن دارهەنجیرە چەتریەکە دانیشت و بە دیار چەقۆکەیەوە کەس نەیزانی بەرەو کوێ چوو.

چیا لە خر لاوە بە تەقوتۆق دەوردراوە، گوللە ڕووەو ئاقاری چل مێرایە، کوڕێ کە ماکێ بەلا ڕوومەتیەوەیە، ڕێك دەڵێی شوێن ماچی دوو لێوی گۆشتنی تێر سووراوە، لەوەشەوە ناوی بووە کوڕی ڕوو بە ماچ، لە هیکەوە هاواردەکات:

هاتن، ئاڵاڕەشان هاتن، ئێوە گوێتان لە (الله و اکبر)یان نیە؟

هێ لە هەشتسمێڵ، هەموو گوێیان هەڵخست، کەس هیچی نەبیست، نە (الله) دێ نە (أکبر)، دیرۆکزان باگۆی دایەوە:

+چ لە گۆڕێ نیە، گوێت زرینگاوەتەوە

-زرینەگانەوەی چی! الله اکبری زاری هۆڤیان وا پێ پێ بە چیادا هەڵدەکشێ، گەیشتن...

کۆچۆیی لە بن لێوانەوە:

ئەوەشمان لە دەستچوو، تێکچوو

کەژێ لە کەلێنی لقی دارهەنجیرەوە سەری دەرهێنا، بە دەنگێکی کە خەوی پێوە بوو:

چل مێرا ئێرە دەپارێزێ.

هیّ لە هەشتسمێل، هەموو بە گوڵەشلێرەشەوە گەشانەوە، سە سپی گەشانەوەی پێوە دیارە، ئاخر بەو رستەیە، لە دنیا تایبەتەکەی خۆیەوە هاتەوە چل مێرا، هاتەوە ناویان و ئێستا دەزانیّ لێرە چ دەقەومیّ.

ئەوان چاوەڕیّ بوون، رستەیتری بە دوادا بێت، نەهات، کەژیّ هێندەی گوت و سەری بردەوە بن هەنجیرەکە و بە دیار چەقۆکەیەوە دانیشت و گەیشتەوە دنیای خۆی.

دیرۆکزان لە بن بەردەکەیەوە کە کەپرێکی هێندەی بەرانپیلێکی بە دیوی سێبەردا پێوە هەڵواسیبوو، تفەنگەکەی بڵند کرد و هاتە گۆ:

لێرە تفەنگێك شەڕی لەشکرێك دەکات، مەترسن، شمشێر و ئاڵای رەشی دەوڵەتی ئیسلامیی لە عێراق و شامیّ، ناگەنە ئێرە، ئێوە دیرۆکی ئێرەتان نەخوێندۆتەوە.

هەندێك قسەکەیان بە هەند هەڵنەگرت، بەڵام هەندێکیان هەستیان لێیراگرت، کەژێش رۆیشتووە، دیار نیە بە گێڕانەوەی دیرۆکزان دەگەڕێتەوە یان نا:

لەوەتەی دنیا دنیایە، زۆری شەڕی دنیا لە سەر چیایە، چیای شنگال، ئێرە ئەو چل مێرایە، دنیا چاویان لێرە بڕیوە، شنگال بە هەڕمێنترین چیای دنیایە، ئاوریشمەکەی بەشی جلکی نیوەی دنیا دەکات، زەیتوون و هەنجیر و ترێکەی نیوەی دنیا تێردەکات، گەنم و جۆی ئەو دەشت و دەرەی هەموو بیاباننشینان لێی بخۆن دەمێنێتەوە، تووتنەکەی ئەوەی جغارەیەکی لێ بکێشێت، لە بنی دنیاوە بێت بە بۆنەکەی بۆی دێت، هەنگوینەکەی سەد دەرد دەپەڕێنێ، ئەوەی جارێك دیتبێتی، بۆ جوانیەکی خۆی بە کوشت دەدات، شنگال بەهەشتی ناو کتێبی ئایینانە.

کەسێ لە بن بەردێکەوە، ئارەقەی نێوچەوانی دەسڕێتەوە و هەڵدەداتێ:

بەهەشتی چی! گوو بە دیرۆك، تۆ چی دەڵێی؟ خۆت نابینی لە کوێی! وازبێنە، برا وازبێنە لەو قسە قۆڕانە، وەرن با بیرێ لە خۆمان بکەینەوە، بزانین..

دیرۆکزان، وەك ئەوەی لە ناو هۆڵێکی گەورەی فێنك بێت و لە پشت بڵندگۆوە وەستابێت و دیرۆك بۆ حەشاماتێکی دیرۆکویست بگێڕێتەوە، دەنگی هەڵبڕی و قسەی کەسی نەبیست:

شنگال، جێی چاوتێبڕینی دنیا بووە، دنیا چاوی لە جوانی و داهات و گرنگیی شاری شنگال و شاخی شنگال بڕیوە، ئێرە جێی شەڕ و شۆڕی میدا و بابلەیەکان بوو، جێی ململانێی ئاشووری و سەفەوی و سەلجووقی وعەباسی و ئۆسمانی و دنیا بووە، لەشکری ئەسکەندەر دنیای گرت، لێرە تێدا ما، حەرووشی سەرلەشکریان لێرە شکا و هەرچی کردی نەگەیشتە ئێرە، نەگەیشتە چل مێرا.

ترك و عارەب و عەجەم، شەڕیان لە سەر شنگالێ مەیە، چیای شنگال لە بن پێی کێ بێ، ئەو بەشەی دنیا لە دەست ئەوە.

مەترسن، چل مێرا ناکەوێتە بن دەستی ئالاڕەشان، جوو رێ بەوە نادا..

زاری دیرۆکزان دەلێی بەلووعەی ئاوێیە، کراوەتەوە، رستە
رستە لە بەرِی دەرِوات و ناگیرێتەوە، باڵەفرِەکە نەبا، تا ئێواری
لە بەری دەرِۆیشت و شنگالی لە تەرِایی دیرۆك هەڵدەکێشا.
لە ساتی هەستانەوە، کەژێ وەك بلێی رستەیەکی ناو خەونێ
بلێتەوە:

جوو نا، چل مێرا رێنادا
کەس رستەی زاری کەژێ نەبیست.

## ڕوانەوە

### چارشەما سۆر

فرۆکە نەویە، دیرۆکزان ئەگەر بیەوێ، ڕەنگبێ بیپێکێ،
چەند سوورڕێکی دا، وێدەچێ بە دوای شتێکی بزربوودا بگەڕێ،
هەموو بە سە سپیشەوە خۆیان شاردۆتەوە، دوور لەوان، لە بەری
باشوور، فرۆکە نەوی بوو، زۆر نەوی، خێرا چەند شتێکی
هەڵدایە زەوی، وەکات بە خێرایی باشوورکە بەرزبۆوە، هەموو
جگە لە سە سپی، بە هەشتسمێڵەوەش گوێی خۆیان گرت،
چاوەڕێی تەقینەوەن، بەلام هیچ نەتەقیەوە.

پاش بزربوونی فڕۆکە، دیرۆکزان و یەك دوانیێ، چوون، بە پێدزە گەیشتنیێ، لە بن بەرد و پنچکان چەند کارتۆنێکی پێچراویان دیتەوە، دیرۆکزان گوتی:

من بزانم، ئەو فڕۆکەیە دۆستە، خواردنی بۆمان هێناوە.

بە ترسەوە، کارتۆنیان کردەوە، گوتی:

نەمگۆت...

دەنگە دەنگ دیێ، هەستیانکرد لە خواریێ، لە شیوەکانی دیوی شاری شنگال، خەڵك هەیە، زۆرن، ئێزیدی بە چیای شنگال کەوتوونە.

خواردنیان کێشایەوە، ئاویان کێشایەوە، ئەو دەمە و ئێوارەیە، ماڵیان گواستەوە، هەر لە تەنیشت دوندەکە، لە پێچکردنەوەیەکی چەند شەقاوی، بە دیوی هەڵدێردا، روو لە باکوور، روو لەو دوندە دوورەی کە بە ئاسماندا چووە، ئەشکەفتێکیان دیتەوە، لە خەیالی کەس نەبوو، ئەشکەفتیێ لەو نزیکە و لەو جێیە هەبیێ، دیرۆکزان بە مەیلە و پێکەنینەوە، گوتی:

ئێرە ماڵی ئادەم و حەوا بوو، مەلەکی تاوس بە راسپاردەی خودا بۆ وانی چێکرد.

ئەشکەفت گەورەیە، لە دیوەخان دەچیٚ، باریك و درێژ هەڵکەوتووە، لە چ لاوەش تۆپ نایگرێتەوە، کەژیٚ ماڵی خۆی نەگواستەوە، توورەگەکەی هەر بە لقی دارهەنجیرەکەوە دەلەرێتەوە، بەڵام سەردانیان دەکات و پێیەکی هەر لەوێیە، بە بێئەوەی وشەیەکی لە زاری بێتە دەریٚ.

پێدەچوو هاتنەکەی پتر بە هۆی گوڵەشلێرەوە بێت، دەهات، چەقۆکەی لە پشتی خۆی رادەگرت، دەیزانی گوڵەشلێرە لەو چەقۆ بە خوێنە دەترسیٚ، دەستێکی بە سەریدا داهێنا و ماچێکی نەرمی دەکرد، زۆر نەرم ئەویش گوێی لە دەنگی ماچەکەی سەر پەڕی روومەتی خۆی نەدەبوو.

هەشتسمێڵیش کە تا ئێستا کەس گوێی لە دەنگی نەبووە، وێدەچیٚ کەڕولاڵ بیٚ، کەڕولاڵیش ئەوها نیە، نە دەست رادەوشێنیٚ، نە سەر بادەدات، نە لێو دەجوولێنیٚ، نە مرقەیەکی لێدیٚ، قەڵەمبڕێکی لە گوێزانی تیژ تیژتری لە دەستە و لە داری

تەڕ ترومبێلۆکەی وا، بووکۆکەی وا بۆ گوڵەشلێرە چی دەکات، لە دەست چ دارتاش و کارگەیەك نایێ، تەنها دار و بەس، تایە و سووکان لە دار، پێ و پرچ و چاو لە دار، هەر بە داریش بە یەکتریان دەبەستێتەوە، گوڵەشلێرە بەو یاریانە خەنی بووە، دایك و ماڵێ و کۆڵان و هەموو چتی لەبیرچووە، هەشتسمێڵ لە گۆ دڵخۆشکردنی ئەوە و چیدی نا، هەر چەندە روو بە ماچ بە زمان و ئاماژەی چاو پێیگۆت:

بڕینی داری تەڕ گوناهە، ما تو نە ئێزیدی؟

بە ئاماژەی نەرمی دوو سێ پەنجە گۆتی:

لە خۆ هەڵدە.

لە پڕ شتێ لە هەشتسمێڵ روویدا، کەس وێنای نەکردبوو، زنجیری جانتا گەورەکەی کردەوە، دەستی لە ناو گێڕا، گێڕا، زۆری گێڕا، پێدەچوو لە چتێکی زۆر گچکە بگەڕێ، نەکەوێتە بەردەستی، دنکە نۆکێکیش با، بەو هێندە دەستگێڕانە، بەر پەنجەی دەکەوت، نەیدیتەوە، ناچار جانتای گوڕکردە پێش خۆی، چی تێدا بێت باشە؟

چەند پارچە پاكەتێ، ئەوە بۆ دیرۆكزان وەك ئەوە بوو، ژنەكەی بە دیار منداڵەكانیەوە مەنجەڵە دۆڵمە هەڵڕژێنێتە سەر سینی، ئاخر جغارەی لە سەر بڕان بوو، بەڵام خۆشیەكە، ئەوەی هەمووانی بۆ چەند ساتێ شاگەشكە كرد، پاكەت نەبوو، شتێ بوو قەوارەكەی هەر هێندەی دوو پاكەت، شتێ، شتێ لە دنیای هێنایە ناو ئەشكەفتەكەی ئاقاری چل مێرای چیای شنگالێ:

رادیۆ

رادیۆیە، پاتری لە سەرە؟

كوڕی روو بە ماچ پڕی دایێ، دوگمەی بادا:

یا ئەیوهەل لەزینە ئامەنو...

لە سەری رانەگرت و بایدا، هەر بایدا:

دیسان فەرمانە، ل مە فەرمانە

دیرۆكزان گوتی:

رایگرە، لێرە رایگرە، بزانین چ باسە؟

كەژێش گەیشت، هەموو گوێیان دایێ، جگە لە گوڵەشلێرە و هەشتسمێڵ و سە سپی، گوڵەشلێرە لەو سەری ئەشكەفتەكە

لەگڵ گەمەکانی خۆی بوو، سەگەکە لە خواری، لە راست زارکی ئەشکەفتی، شتێکی دەخوارد، هەشتسمێلیش وردەواڵە و نووردووە نانی لە چانتاکەی دەکردەوە، دوای تەواوبوونی (فەرمان)ەی شڤان:

((لەشکری دەوڵەتی ئیسلامی لە عێراق و شامی، ناسراو بە (داعش) دوایوەی شاری شنگال و تەواوی گوند و ئاوایی هەر چوار دەوری چیای شنگالی داگیرکرد، کەوتە رەشەکوژیی ئێزیدیان و دەستی لە گەورە و گچکە نەپاراست، هەندێ لەو عارەبانەش کە چەندان پشتە لە تەنیشت ئێزیدیان دەژین، دیواریان بە یەکەوە، بەگەڵ داعش کەوتوون و بە ناو ئێزیدیان وەربوونە...))

هەموو لە جێی خۆیان وشکبوون، پێنەدەچوو ئاگایان لە رادیۆ مابووێت، رۆیشتن، چوونەوە لای کەس و کاریان، لە خەیاڵ دەیاندیت، چۆن پەلاماردەدرێن و...

((دوایوەی ئەبوو بەکر بەغدادیی خەلیفەی دەولەتی ئیسلامی، فەرمانی دا، فەتوای دا: ئێزیدی گاورن و سەر و ماڵیان بۆ برایانی موسڵمان حەڵاڵە، ژن و کچیان حەڵاڵە و..))

کوڕە روو بە ماچەکە بە خۆی نەوەستا و تفێکی لە رادیۆکە کرد و تێیهەڵدا، باش بوو، لە سەر توورەگەیەك کەوتەوە، لە دەنگ نەکەوت، دیرۆکزان غاری دا و هەڵیگرتەوە، بە بن گوێی خۆیەوە نا:

(( ئێستا لە بازاڕێ نەیناوا بە بەر چاوانەوە، لە شێوەی مەڕ و ماڵات، کچ و ژنی ئێزیدی هەڕاجکراون و داعش لە داعشی دەکڕێتەوە، هەر یەکەو نرخێکی لە سەرە، کۆیلایەتیان زیندووکردەوە، کچ و ژنی ئێزیدی گەیشتنە بازێڕی شامیێ، گەیشتنە..)

دیرۆکزانیش بەرگەی رادیۆی نەگرت، بەڵام تێیهەڵنەدا، بە نەرمی لە پێش هەشتسمێلێ دانا، ئەو لە سەر وسیمای ئەوانەوە تێگەیشت، رادیۆکەی هەواڵی جەرگبڕی وەشاندووە، دەیویست پێبکەوێ، بپرسێ:

رادیۆ چی گوت؟

نەیویست بیزانێ، یان رەنگە هەستی کردبێ، بە زمانی ئاماژە نەتوانن هەواڵەکەی بێ زیاد و کەم تێبگەیەنن.

هەشتسمێل پەشیمانی بە سیمایەوە دیار بوو، پێدەچوو بڵێ:

ئەگەر رادیۆکەم نیشاننەدابان، هەواڵی جەرگبڕیان نەدەبیست، لەو ساتەی لە دوای دوگمەی کوژانەوە دەگەڕا:

(( ئەوەی داعش بە ناوی ئیسلامەوە دەیکات، دوورە لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام، ئیسلام ئایینی پێکەوە ژیانە، ئایینی ئاشتی و براییە..))

کوژاندیەوە و خستیەوە ناو توورەگەکەی.

دیرۆکزان بە تەوسەوە:

ئایینی پێکەوە ژیان!

کەژێ، تیچاوێکی خستە سەر دیرۆکزان، بەڵام زوو لایدا و نەیهێشت بیبینێت، دیرۆکزان:

ئەوەی لەشکری ئالای رەش دەیکات، تازە نیە، فەرمان و فەتوای بەغدادی لە دەرێی ئایینەوە نەهاتووە، دیرۆك، سەد، تۆ بڵێ هەزار بەغدادی تێدایە...

ئەو ئێوارەیە لە سایەی رادیۆکەی هەشتسمیڵەوە سیماکان لە هەموو کات، غەمبارتر دیارن، بە سیمای گوڵەشلێرە و سە سپیشەوە دیار بوو.

تاریك داهات، کەژێ لۆژە لۆژە بەرەو ماڵەکەی خۆی رۆیشتەوە، دیرۆکزان بە دوایدا چوو، لە بن گابەردەکەوە، بێئەوەی پێبکەوێ، کەژێ گوێی بۆ رادێراوە یان نا، دیرۆکی گێڕایەوە، بۆ مانگەشەوی شنگال دیرۆکی گێڕایەوە:

کچەکەم، وەرەوە سەر خۆ، خۆ مەکوژە، تێدەپەڕێ، ئێزیدی لەو فەرمان و فەتوایەش دەردەچێ، تا چیای شنگال مابێ ئێزیدی دەمێنێ، ئێزیدی لە بن گەلەك فەرمان و فەتوای لەوەش رەشتردا دەرباز بوون و دەستبەرداری ئێزیدیاتی نەبوون وەکو شنگالی سەرکەش، سەرکەش مانەوە...

دیرۆکزان جاروبار ئاوڕێ دەداتەوە، سەر بەرزدەکاتەوە، بەڵام جێی کەژێ بڵندە و نایبینێ، بە دیار مانگەشەوەوە بە گێڕنەوەی گرتووە:

تۆ لە من باشتر دەزانی، بەغدادی نەوەی کێیە و گیانەکان لە کێوە هاتوونە و گەیشتوونەتە ئەو، تۆ تەماشاکە هەموو نەوان رۆیشتن و ئێزیدی مایەوە، ئەگەر تەنها دوو ئێزیدی لە

دنیایێ بمێنن، زاوزێ دەکەن و زۆر دەبنەوە و شنگال پڕدەکەنەوە لە ئێزیدی، ئەدی وانیە؟

وەلآم نیە و چاوەڕێش ناکات:

تۆ بڕۆ دیرۆك بخوێنەوە، بزانە چەند فەتواو فەرمان لە سەر ئێزیدیان دەرکردووە لە هەر یەکیان چەن هەزار ئێزیدی هاتنە کوشتنێ، چەند ژن و زارۆی ئێزیدیان بە تالآن بردووە، لە باژێری موسلمانان لەگەلێ گاو گۆلان سەودایان پێکردووە، کەچی ئێزیدی بە وێنەی دارو درەخت لە وەرزی لە دایکبوونەوە، لە شنگالێ کەسکبوونەتەوە و هاتوونەتەوە ناو ژیان، لە منی وەرگرە، لە چوارشەمە سوورەیەکیتر لە دوو چوارشەمە سوورەیتر، وەرەوە ئەو شنگالە وەك پێش ئەو فەرمانەی ئێستا ئێمەی تێداین، جوانتر دەڕوێنەوە...

دیرۆکزان پشووێکی دا و کەوتە ژماردنی فەتوا و فەرمانان:

یەکەم فەتوا و فەرمان هی عەیازی کوڕی غەنەم بوو، ئەو ناوەی رووتکردەوە لە ئێزیدیان، فەتوا دوای فەتوا هات، ئەوە هی ئەحمەدی کوڕی حەنبەلی، هەزار و هێندە ساڵە، ئەویش ئێزیدی بە شەیتانپەرست ناو نا و گوتی:

هەر موسڵمانێ ئێزیدیێ بکوژێ، دەچێتە ناوەندی بەهەشتێ.

ئەدی فەتوای لیسی سەمەرقەندی، گوتی:

بە پێی ئایەت و فەرموودان، ئەوەی ئێزیدی بکوژێ، دەستی کەسك دەبێ.

فەتوای چەند زانای ئیسلامیت بۆ بژمێرم، ئەوە فەتوا ڕەشەکەی عەودولاّی ڕیتکی، ئەدی ئەوەی کوڕی سعوود یان بابێ سعوود، فەتواچیەکەی سلێمان قانوونیی ئۆسمانیان، دەردی ئەوە لە هەموویان گرانترە.

دیرۆکزان دەیان فەتواو فەرمانی بە سەر کردەوە، زاری شل بوو، ڕۆیشت، ئاوڕێکی لە دارهەنجیرەکەی بن تریفەی مانگەشەوێ دایەوە، بەرەو ئەشکەوتەکە لێژ بۆوە.

کەژێ ئەو شەوە تا خەو بردیەوە، بیری لە فەتواکەی موفتیی ئۆسمانی کردەوە، لە بارەی ئەو پیاوەوە، لە پیری چل چلەی مامیەوە زۆری بیستبوو، بەلاّم باشی بیرنەدەکەوتەوە.

## سوێندی خودێ

## هەنجیر و زەیتوونی شنگالێ

ڕۆژ لە تاقی ئاسمانێیە، باڵەفڕ لە ئاسمانی چیای شنگالێ دەسووڕێتەوە، جاروباریش لێرە و لەوێ، تەواو نەوی دەبن و لەوەیە شتێ بەردەنەوە، کوڕەی ڕوو بە ماچ تووڕەیە، پتی لێدەی دەتەقێ، دێت و دەچێ، پێدەچێ لە گڤ بڕیاردانێ بێ، بۆی یەکلانابێتـەوە، بیدات یان نەیدات، تا شل بوو لە نێوان دوو بەردەکەی بن ئەشکەفت، کە دەتگوت دوو کێلی گۆڕێکی درێژن، ڕاوێچکەی کرد، تینی تێدا نەما، پشتی بە بەردێکیان دا، وا دیارە نەگەیشتە چ ئاکامێ، لەو دەمە لەو گەلیەی

ئەشکەوتەکی بە سەردا دەڕوانی، لە لای خواری، باڵەفڕێ تەواو نەوی بوو، هێندەی نەمابوو باڵی لە بنە داران گیر بێ، شتێکی بەرداوە و بەرز بۆوە، کوڕەی روو بە ماچ، یەك بە گەرووی ئەشکەفتەکە هاواریکرد:

گوو بە شەڕەفت، گوڕگان خواردمان دەکەیت و خواردنیشمان بۆ هەڵدەدەیت؟!

گوڵەشلێرە لەو دەنگە زیڕاندی و سەگەکەش پێش هەمووان گەیشتە لای و لە بەردەمی وەرکەوت، بۆنی بە پێیەکانیەوە دەکرد، هەشتسمێلیش کە دیتی گوڵەشلێرە دەگریێ لە باوەشی کرد، کەژێش بە غاردان گەیشتێ و ماچە نەرمەکەی لێکرد، گوڵەشلێرە گیربۆوەو دەستی بە گەمەکردەوە.

رۆژ لە سەر شنگالە، هەشتسمێڵ روو لە رۆژێ نوێژی دابەست، گوڵەشلێرە لە تەنیشت وی، هێند ناسك دەمەلاسکەی دەکردەوە، موسڵمان دیتبای حەزی دەچووە نوێژی ئێزیدیان، سە سپیش لەو لاوە چاوی لە سەر گوڵەشلێرە هەڵنەدەگرت، لەگەڵ جوولەی وی برژانگەکانی دەجوولانەوە، لەو ساتە کەژێ بە

چەقۆوە رایکرد، سەگەکە کەوتە دوای، بەتەنیشت ماڵەکەی خۆی سووڕایەوە، هەموو تێگەیشتن، بەزمەکەیە، خوێندنەوەی بەردە، دیرۆکزان و کوڕەکۆچۆیی، بەرزە پێ هەستان و بە دوایدا چوون.

کەژێ لە شوێنی خۆی، لە بن درەختەکەی دیرۆك خوێندنەوە، رووەو بەردە پەڕی دیرۆك قیت راوەستا، تەواوێ هەستی راگرت، تەنبوور هات، لاوکی (شنگال هایێ ل من) بە پەنجەی عەودالی تەنبوورژەن هاتە گوێی، سەری هەڵبڕی، چاوی گێڕا، دیار نیە:

مام عەودال تۆ لە کوێیییییی؟

دەنگی درێژکردەوە لە شنگال دەنگیدایەوە، کوڕە کۆچۆیی، گۆتیە دیرۆکزان:

هەر بە راستی ئەو کچە دین بووە.

دیرۆکزان:

خۆزی هەر ئێزیدیەك تێکدەچوو، مینا ئەو کچە بە تەنبوور و دیرۆکی دەگرت.

کەژێ چاوی خستەوە سەر پێنووسی تیرۆژ و بەردی کاخەز، دەستی درێژکرد و نووکی چەقۆکەی لە ئاستی تاشەبەردەکە راگرت، وەك بلێی بیخاتە سەر وشەکان، لەگەڵ خوێندنەوەی هەر رستەیەك نووکی چەقۆی دەجوولاند، چەپ و راست و بەرز و نزمی پێدەکرد، پیری چل چلەشی گەیشتێ، خوێندیەوە:

گەڕیدەیێ هەیە، لە کوڕی بەتووتە پتر بە دنیادا گەڕاوە، دنیای لە شێوەی ناو لەپی خۆی لە بەر چاوە، لە وەلاتی فیرعەونان و سارای سیناوە بگرە تا دەگاتەوە هیندستان و بوخارا و کێوی قاف، تا ئەو دیوی سیبریا و چینماچین ، دیمەن دیمەن، هەمووی وا لە ناو پەڕاوی گەشتەکەی تۆمارکراوە، ئەو گەڕیدەیە بست بە بستی دنیا گەڕاوە، شار نەماوە سەرخەوێکی لێ نەشکاندبێ، چیایەك نەماوە ئاوی لە کانیەکی نەخواردبێتەوە، گەڕیدەی دنیادیتە، بە رێی شامدا سەری لە چیای شنگالیش داوە.

کەژێی کەزی زەر پەلە دەکات لە خوێندنەوە، تفیش قووتناداتەوە:

گەڕیدەی شنگالدیتە، ڕۆژێ ڕێی دەکەوێتە کۆشکێ سوڵتاتی ئۆسمانی، سوڵتان سلێمانی قانوونی، سوڵتان دەڵێتە گەڕیدە:

بیستوومە نیوەی دنیا گەڕاوی، بێژە من، چ جێیەك لەو نیوەی دنیایە، دلڕفێنتر و بە بەرووبوومترین جێی دنیایە؟

گەڕیدە کەمێ بیردەکاتەوە:

گەورەم، شنگال.

سوڵتان:

شنگال لە چینماچینە؟

گەڕیدە:

نا، گەورەم، لە بن قەڵەمڕەوی ئۆسمانیە، لە بن دەستی خۆتانە.

سوڵتان:

کەوتۆتە کوێ:

گەورەم لە چیاکانەوە لە زێی دەچلەوە بۆی دەچی، کەوتۆتە نێوان نەیناوا و حەلەب.

سوڵتان:

جوانیی ئەو چیایە چیە؟

گەڕیدە:

گەورەم، ناهێتە وەسپکرنێ، چیایەکی دوور و درێژە، هەر چوار دەوری دەشت و پێدەشتە، شنگال لەو دەشتە بە ئاسماندا چووە، تەنیایە و شان ناداتەوە چ چیایێ، ئەو چیایە شارێکیشی لە ئامێز گرتووە، دەڵێی ئەستێرەی سیوەیلە بە ئاسمانەوە، ئەویشی بە ناوی خۆیەوە کردووە، بە شەو و رۆژ دەدرەوشێتەوە، لە جوانیی ژنەکانیشی گەڕێ، حۆریەکانی ناو ئایەت و سوورەتانن.

سوڵتان قومێ لە جامەکەی پێشی دەدات و دەڵێ:

ئێ، بڵێ.

گەڕیدە بۆی دەچەمێتەوە و دەچێتەوە سەر جوانیی چیا:

گەورەم، چیا لە دوورەوە، لە سەر چیاکانی دوورەوە، لە کەشتیەکی رەنگارەیی دەچێ، هەر رەنگێت دەوێ لەوێ هەیە، هەندێ رەنگ هەیە، تەنیا لەوێ هەیە، ئەو چیایە لە کەشتی چووە، دووریش نیە هەر کەشتیەکەی نووح بێت و مابێتەوە!

تۆ لە دوورەوە تەماشاکە، شنگالی کەشتی، وا نەرم نەرم بە ناو دەریایەکی لە لایەك شین شین لە ئاسمانی شین شینتر، لە چاوی کچانی ئەستەنبوول شینتر، لە لایەك کەسك کەسك، لە بەهاری ئورفە، ئورفەی زێدی پێغەمبەران کەسکتر، لە لایەك سپی سپی لە بەفری سیبریا سپیتر، شنگالی کەشتی لە ناو دەریایەکی لەو هەموو رەنگە، رووو و رۆژهەڵات شەپۆلان دەبڕێ.

لە هەر وەرزێکی ساڵ بە چیای شنگالدا بگەڕێی، بە سانایی هەر چوار وەرزی ساڵ دەبینی، لەو سەرە لە کەویە بەفر پەکت ناکەوێ، لەو دەستە بەهار بە هەموو گوڵ و کەسکایی خۆیەوە هەڵیداوە، هەڵدانێ هەرگیز بارگە و بنە ناپێچێتەوە و بارناکات، ئەها، لەو بنارێهێ، بای پایز هەڵیکردووە، لە بای پایزی جێیان ناچێ، بایەکە تایبەت بە پایزی شنگال، با وردە گەڵای لە دەستە، با مەست مەستە، با بە گەڵاوە، مۆسیقایەك دەژەنێ لە بەهەشتیش کەس نەیبیستووە، لە شیوەکەی خوارێش، خەرمانانە و رەوسەی گەنم و جۆ...

سولّتان، پێناچیّ بۆ هیچ کەسیّ، بۆ هیچ حەکایەتخوانیّ بەو شێوە گوێی شل کردبیّ، قومیّ لە جامەکە دەدات و دەڵیّ:

گەڕیدە، باشە، ئەو شنگالەی ئێمە چ بەروبوومێکی هەیە؟

گەڕیدە:

جا، چی نیە، گەورەم؟

ئاوریشم، ئاوریشمەکەی شنگالیّ لە ئاوریشمی چ جێیان ناچیّ، من لە دنیاییّ ئاوریشمی وام نەدیوە، تا بە چاوی خۆت چاوی نەکەیتیّ، تا دەستی نەدەیتیّ، نازانی چ ئاوریشمە، ئەوجا گەلەك زۆریشە، ئەگەر خزمەتی هەبیّ، بەشی هەموو وەڵاتی ئۆسمانیان دەکات.

هەنجیر و زەیتوون، وای ، وای! من دەڵێم خودا سوێندی بە هەنجیر ی زەیتوونی شنگالیّ خواردووە، هەر دەبیّ سوێندی بە هی ئەویّ خواردبیّ، نیە، گەورەم، نیە، هەنجیر و زەیتوونی وا لە سەر زەوی نیە، بەڵام نازانم لە بەهەشتیّ!

هەنگوین، گەورەم، هەنگوین، مەپرسە هەنگوینی وێندەریّ، چ هەنگوینە! ئاخر هەنگی شنگالیّ دەزانی لە سەر چ جۆرە

گوڵێ دەژین؟ ئەو گوڵەی لەوێ هەیە، من لە وەڵاتی فەرەنگیانیشم نەدیتووە.

گەورەم، هەر کەسێ رۆژی سەرە پەنجەیێ لە هەنگوینی شنگالێ بخوات، ناڵێم نامرێ، بەڵام چ نەژی، سەد ساڵی خۆی مسۆگەرە، تەمەنەکی بێ ئازار و دەردیش، هەنگوینی ناو کۆلکەدارانی شنگال، سەد دەردیش دەپەڕێنێ، من کە گەیشتمە وێندەرێ، دوو سێ دەردم هەبوو، حەکیمەکەی چینیش سەرەدەری لێدەرنەکرد، بە هەنگوینی ماڵە ئێزیدیان بەڵام لێبڕا، ئێستا دەمبینی لە گوێزی ساغ ساغترم.

ئەدی ترێ و مێوژەکەی؟ گەورەم سوێند بە قورئانی موحەمەدی عارەبی دەخۆم، بە تاج و تەختی تۆ، بە جامی دەستی تۆ دەخۆم، ئەو شەرابەی بەهەشتێ کە خودای گەورە لە قورئان باسی کردووە، بۆ بەهەشتیانی وەك ئێوەی حەڵاڵ کردووە، من دەڵێم لە مێوژی شنگالییە، وەی خوایە، لەو مێوژە، مستێکی لێ بخۆ، تەواو، مێوژی چ رەزێکت پێناخورێ.

گەورەم، ئەدی ئاوی کانیاوەکانی، بەو خودایە، ئەو خودایەی تاك و بیٚ هاوتایە، ئەو خودایەی گەورەیی و سیٚبەری ئیٚوەی بە سەر ئیٚمەوە دانایە، بەو تاجەی سەری تۆ، کە سیٚبەرکەی بۆ موسلْمانان هەتا هەتایە، ئاوی شنگالیٚ ئاو نیە، خۆشاوی بەهەشتیٚیە، ئەو خۆشاوەی خۆشەویستی خوا بە دەستی خۆی بە زاری ئیٚوەوەی دەکات، هەر کەسیٚ لەو ئاوە بخواتەوە، نەخۆشیی لیٚ نزیکنابیٚتەوە.

گەورەم، ئەدی بەڕوو، ئەو بەڕووەی لە جیٚیان لە دار بەردەبیٚتەوە، کیٚ دەیخوات؟ وەرە بەرووی شنگال ببینە، بیخە ناو خۆلْەمیٚش و بیپیشیٚنە و بیشکیٚنە و تامی بکە، هەینیٚ دەزانی بەڕوو چیە، گەورەم بەڕووی چیای شنگالیٚ بەڕوو نیە، قەسپە قەسپ، چ قەسپیٚ، لە بەسراش قەسپی وا نیە و نابیٚ، خۆ قەسپی بەسرات خواردووە؟

گەورەم، بەڕووی شنگالیٚ هەر بە ناو بەڕووە، پیٚم سەیرە چۆن لە قورئانیٚ ناوی نەهاتووە، ئەریٚ گەورەم ناوی هاتووە؟

سولْتان:

بە من بڵێ، چ تیرەك لەوێ نیشتەجێن؟

گەڕیدە:

تیرەکی دڕی بێ دین، ئەوانە ئێزیدین، دەڵێن، خودا ناناسن، شەیتان دەپەرستن، ئەو ئێزیدیانە وەکو کەتیرە بە شنگالەوە نووساون و لێینابنەوە، دەڵێن، کاتێ لافاوی نووحیش هەستا، ئەوان لەوێ مانەوە و نەهاتنە ناو کەشتیەوە، دنیایان بدەیتێ دەستبەرداری ئەوێ نابن. ئێزیدی بە ژن و منداڵەوە سوارچاك و نیشانشکێنن، رێنادەن چ نەیارێ لەو چیایە نزیکبێتەوە، سەرانەکی کەم دەدەنە والیی نەیناوا و ئاو بێنە و دەست بشۆ.

سوڵتان:

ئەو شەیتانپەرستانە، بە چ زمان داخڤن؟ عەجەمی یان عارەبی؟

گەڕیدە:

گەورەم، نە عەجەمی نە عارەبی، بە زمانی سەلاحەدینی ئەیووبی

سوڵتان:

زمانی سەلاحەدین چ زمانە؟

گەڕیدە:

گەورەم، کوردی

سوڵتان:

کوردیش زمانی هەیە؟!

سوڵتان، وەك تارمایی خەون دیمەنی کوشتنی حوسێن بەگی داسنی بیردەکەوێتەوە، ئەو بەگە ئێزیدیەی بە فەرمانی خۆی کوشتی.

سوڵتان کیسەیەکی گچکە دەداتە گەڕیدە و بە ئاماژەی چاو بە ڕێیدەکات.

کەژێ کەمێ دەوەستێ، وێدەچێ، شتێ بەر چاوی گرتبێ و خەتی تیرۆژی سەر بەردێ نەبینێ، چاو بە چەپ و راستدا دەسووڕێنێ، پاش کەمێ خەت دەبینێتەوە، تۆ بڵێ واچەی پیری چل چلەی بیردەکەوێتەوە:

سلێمانی قانوونی مەرگ دەبیات، پێڕا ناگات، دەستی بە جوانیی شنگال و کچە حۆریەکانی بگات، ئەو کارە بە دوای خۆی، بە کوڕەکەی دەسپێرێ.

سوڵتان گازی نۆبەتچی دەکات و دەنێرێتە دوای فەتواچی، فەتواچی کێیە؟ هەر ئەوەی پێشێیە، لە سیما و سەر و کەللە، بە ترك ناچێ، بە عارەب ناچێ، بەڵام لە ترك باششتر ترکی گۆدەکات، لە عارەب رەوانتر قورئان دەخوێنێتەوە، ئەو فەتواچیە، کوڕی سعوودی دەڵێنێ، موفتیی هەموو ئۆسمانیانە، دەست لەسەر سینگ و لە سەر چۆك دێتە خزمەتی سوڵتان:

گەورەم، ملی من و شمشێری ئێوە.

سوڵتان دەپرسێ:

مەلا، تۆ ناوی ئێزیدیت بیستووە؟

کوڕێ سعوود:

بەڵێ، گەورەی موسڵمانان.

سوڵتان:

وا دیارە ئەوانە شەیتانپەرستن.

کوڕێ سعوود:

بەڵێ گەورەم

سوڵتان:

باشە، خوا پێیخۆشە ئەوانە لە ناو موسلمانان بژین؟

کوڕی سعوود:

تۆ چۆن دەڵێی ئەوهایە.

سوڵتان:

قڕکردنی ئەوانە ئەرکی موسڵمانانە.

کوڕی سعوود:

ڕاست دەفەرمووی، ئەو شەیتانپەرستانە دەبێت قڕبکرێن.

سوڵتان:

بە من بڵێ، پێشتر چ فەتوا و فەرمانێ لە سەر ئەو شەیتاپەرستانە دەرچووە؟

کوڕی سعوود کەمێ بیردەکاتەوە:

زۆر گەورەم، زۆر لە ژمارە نایە.

سوڵتان:

دەمەوێ فەتواکەی تۆ لە هەمووان پتر بڕبکات، منداڵێکیشیان دەرنەچێت...

کوڕی سعوود:

تەنها ئەوشۆ مۆڵەتم بدە.

سبەی زوو، فەتوا بە واژۆی کوڕێ سعوودی فەتواچیی ئۆسمانی خوێندرایەوە، نێردرا بۆ سەر لەشکران.

کەژێ، نەیتوانی یان نەیویست فەتواکە بخوێنێتەوە، ڕەنگە تیشکدانەوەکە بە هێز بووبێت و چاوی تێکدابێت، یان لە دڵپڕی و ڕقدا، زاری هەڵنەهاتبێت بیخوێنێتەوە، تۆ بڵێ بیلێتەوە، ڕووی وەرگێڕا و بەرەو کانیەکە لێژ بۆوە.

دیرۆکزان گۆتیە کوڕە کۆچۆیی:

تۆ ئەو فەتوایەت بیستووە.

کوڕە کۆچۆیی:

نا، تازە گوێم لەو سعوودە دەبێت.

دیرۆکزان:

من شتێ لە فەتواکەی فەتواچیی ئۆسمانیم لەبیرماوە، تێیدا دەڵێ:

((ئێزیدی لە هەموو گاوران گاورترن، لە ناو جەرگەی موسڵمانان، لە ناو جەرگەی ئایینی موحەمەدە مستەفا، شەیتان دەپەرستن، ئەو شەیتانەی لە خودا یاخی بوو...

ئێستا لە لە هەناوی هەر ئێزیدیەك شەیتانێ هەیە...

ئێزیدی بەو شەیتانپەرستیەوە، چیایەکی زۆر پیرۆزی موسڵمانانیشیان داگیرکردووە، ئەویش چیای سن جارە، جگە لە زۆر شوێنیتر.

بۆیە پەپێی ئایەتی.......... و فەرموودەی...... لە سەر موسڵمانان پێویستە ئەو شەیتانپەرستانە لە سەر دنیا رەشکەنەوە و رەوانەی دۆزەخیان بکەن.

لە سەر لەشکری موسلمانانە، لە هەموو لایەکەوە و هەڵمەت ببەنە سەریان، سەر و ماڵیان حەلاڵە، کچ و ژنەکانیان حەلاڵە و بیانکەنە کەنیزە و کۆیلە...

هەر موسڵمانەکیش لەو رێیە شەهید بێت، بێ (مەن رەبووکە) و چ پرسیاران، بێ حەفت و هەشتێ، دەچێتە ناوەندی بەهەشتێ ))

دیرۆکزان و کوڕە کۆچۆیی، ڕێی کانیان گرت، لەو دەمە، کەژێ گەڕایەوە و چۆوە دیار تاشەبەردان، ئەوانیش بە دوایدا چوون، دیرۆکزان دەڵێ:

من نامەوێ، رستەیەکی ئەو کچەم لە دەست بچێ.

کوڕە کۆچۆیی:

منیش، هەر بەراستی دەنگیشی زۆر تایبەتە، راتدەکێشێ...

ئەوانیدیش هاتن و بە تەنیشت کەژێوە راوەستان و سە سپی و گوڵەشلێرەش لەو بەردانە نزیکبوونەوە کە کەژێ دەیخوێندنەوە، هەشتسمێڵیش لە تەنیشتەوە زەق زەق تەماشای زاری کەژێی دەکرد:

دوای فەتوای فەتواچی، لەشکری ئۆسمانی بە ناو ئێزیدیان وەربوون، لەولا لە دەڤەری مێردینەوە دەستیان بە دوورینەوەی ئێزیدیان کرد، لە ئورفەی زێدی برایمەوە ئێزیدییان دووریەوە، هاتن لە خڕ لاوە هاتن، گەیشتنە لالش، لەگەڵ زەوی تەختیان کرد، کانیا سپی، ئەو کانیەی لافاوی نووحیش رەنگی نەگۆڕی، ئەو لافاوەی رەنگی هەموو کانی و ئاوی دنیای گۆڕی، هی

کانیی سپی وەك پێش لافاو مایەوە، ئۆسمانی بە خوێنی ئێزیدی سۆریان کرد، مەزاری شێخادیان کردە ئاوەدەست، سەر لەشکر گۆتبوویە لەشکر:

ئەوە گۆڕی گەورەترین شەیتاپەرستی دنیا، وەرن گووی لە سەر بکەن.

ئەو شێخادیەی مەزارەکەی کرایە ئاوەدەستی لەشکری موسڵمانی ئۆسمانی، هەر ئەو شێخادیەیە کە شێخ عەبدلقادری گەیلانی، شێخی گەورەی موسڵمانان، دوای چەند دیدارێ لەگەڵ ئەو زاتە پاکە گۆتبووی:

(( ئەگەر پێغەمبەرایەتی بە رەنج و کۆشش بە دەست هاتبا، ئەوا شێخادی بە دەستی دەهێنا، بەڵام دیارە هەڵبژاردەی خودایە، پەیام لە محەمەدا کۆتایە.))

شێخ ئەودلقادری گەیلانی ئاوا، قسەی لەو شەیتانپەرستە، کردووە!!

کەژێ لە خوێندنەوەی دیرۆك گەرم داهاتووە:

سوپای ئۆسمانی بە ناو ئێزیدیان وەربوون، شەڕ گەرمە، ئێزیدی دەستدەکەنەوە، بە ژن و منداڵەوە شەڕ دەکەن و ئۆسمانی دەکوژن، بەڵام بە چی دەچێ، لەشکر بنی نایە، لەشکر دەست ناپارێزێ، ورد و درشت مل پەلدەدات، لە سەری ئێزیدیان گرد چێدەکات، ئۆسمانی نێر دەکوژێت و مێ دەبات، لەوەی بەردەستی کەوت، کیژمیزی نەهێشت، ئۆسمانی هات، لە هەموو لاوە هات، باعەدرێ و ئەو ناوەی لە خوێنی ئێزیدیان سۆرکرد، هات، لە خر لاوە دەوری چیای شنگالی داوە، شەڕ گەرمە تیری تێناچێ، شەڕ گەرمە و خوێن سەران دەبات، هێندە ئۆسمانیەی لە رێی گرتنی شنگال کوژران، سوڵتان هیند و چینی پێدەگرت، بنی نایە، ئێزیدی چەندی دەکوژێ، ئۆسمانی بنی نایە، لەشکری ئۆسمانی بە ترك و عارەبەوە تیر بە شنگالەوە دەنێن، شمشێریان لە شنگال هەڵکێشاوە، لەشکری ئۆسمانی بە چاوساغیی کوردی موسڵمان، بە سەر لاشەی ئێزیدیان رێی چیا دەکەنەوە و هەڵدەکشێن...

شاری شنگال بن خوێن کەوت، هەر چوار دەوری چیا خوێنە، لە دۆڵ و شیوانەوە خوێن خوڕەی دێ، بڕوانە، چیای شنگال کەشتیەکە خوێنی لێ دەچۆڕێ و لە ناو دەریای خوێن روو لە رۆژ راوەستاوە.

ئۆسمانی نێر دەکوژێت و مێ دەبات، شەڕ گەرمە و ژن و کچ و منداڵی ئێزیدیان گەیشتنە بازێڕێ نەیناوا، گەیشتنە بازێڕی بەغدایێ، بە رست گەیشتنە وەڵاتی شام و ئەستەنبولێ، زۆر بازێڕێ ئۆسمانیا، ئێزیدی بە ئاشکرا دەهێنە کڕین و فرۆتنێ، بەبەر چاوی خودا و سوڵتان و شێخ و مەلاوە، لە پێش دەرگای مزگەوتان، لە مەیدانی ئاژەلان، لە سەری کوچە و کۆڵانان، کۆیلەدار جاڕدەدا:

وەرنە کۆیلان، وەرنە کەنیزان، وەرنە ژنی جوانی ئێزیدیان، حەلاڵ حەلاڵ، وەکو شیری دایك حەلاڵ، بە پێی فەرموودە و ئایەتان.

شەڕ گەرمە لە چیای شنگالێ، لەشکر پێ بە پێ، بە چیادا هەڵدەگەڕێ، وا گەیشتنە نزیك ئاقاری چل مێرا، چل مێرا ناهێتە گرتنێ، شەڕ درێژە دەکێشێ، ئۆسمانی لەوە پتر نەشێ بێنە پێشێ، لێرە تووشیان بە تووشی تارمایی بووە، تارمایی وا بەر تیر و شیر ناکەون، ئەوانە چل مێرەکەن و شەڕدەکەن، شەڕی مانەوەی ئێزیدی و شنگال دەکەن، ئەوانە بە تیرێ سینگی دە ئۆسمانی دەسمن، بە شیرێ ملی حەوت ئۆسمانی دەپەڕێنن، ئەوانە چل مێری ئێزیدین، رێنادەن توخمی ئێزیدی، ئێزیدیی ئێزدی تاك و تەنیا ببڕێتەوە، دێنە دەست و ئۆسمانی تارومار دەکەن.

ئۆسمانی لە سەری چیا دەشکێ و بە سەر تەرمی خۆیدا دەکشێتەوە، غلۆر دەبێتەوە، لە بنار دەگیرسێتەوە، دەنگێك لە سەری چل مێراوە بەرزدەبێتەوە، دەنگێکی خودایی، ئێزدیی، دەنگێك ئێزیدی لە هەر کوێی دنیا بێت دەیبیستێ:

خەبەر بدەن کوردستانێ

بلا قایم کەن ئیمانێ

شەرفەدین میرێ دیوانێ

ئەو هەندە ئێزیدیەی، ماڵە موسڵمانانی کورد پەنایان داون،
ئەوانەی لە کونە شاخ و کەندڕان خۆیان شاردۆتەوە، ئەوانەی
تەرەی ئەودیوی دەسەڵاتی ئۆسمانی بوونە، گوێیان لە بانگەوازی
سەری چل مێرا دەبێت، لەنوێوە ژیان دەستپێدەکەنەوە.

چریکەی سالحۆ و تەنبوور نەهاتبا، کەژێ تا دوا تیشك،
تیشکی سەر تاشەبەردی شنگالێ، دیرۆکی ئێزیدیانی، داستانی
چل مێرای بۆ خۆی، بۆ شنگالی دەخوێندەوە.

## سالحۆ و کەژێ

## تیتلەکناچەی سەر زێ

لە شێوەی کارمامزی ماندوو، بە چل مێرادا هەڵگژا، لە چاو دیار نەما، دەرکەوتەوە، لە سەر پشتی تیشەشاخێ کە لە تەنکێشەوە کتومت مایینی شیرکیە، هەستابێتە سەر پاشوو.

چیای شنگال گەرمە، لە چلەی هاوینێ دانە رۆژێ بای لە سەر بگرەوە، تیشە شاخ و تاشە بەردی وەها سووردەبنەوە، ئەو تیشەی کەزی زەری لە سەرە، بڕۆ جغارەیان پێداگیرسێنە، بەڵام شنگال کەی بێ با بووە؟ قەوالێ دەڵێ:

لە چیای شنگالی

نابڕێ بایی شەمالی

شنگال باگرە، بای فێنك، هوڕە رووی تێناكات، شەمال هەمیشە شەمال، بەو هاوینە بایێ كەزیی كەزی زەر دەشەكێنێتەوە، دەڵێی لە ناو گوڵێلكە نیسانەوە هەڵیكردووە.

سە سپی زوو گەیشتە لای، لە دەوری تیشەكە دەسووڕایەوە، ناوە ناوە روو لە كەژێ چەند حەپەیەكی نەرمی دەكرد، حەپە نەبوو، گازكردن بوو، كەژێ ئاگای لە گازكردنی سە سپی نەبوو، رۆیشتبوو، لە تەنبووری عەودال و چریكەی سالحۆدا رۆیشتبوو، دەبینێ، داروباری چیا لەگەڵ (هایێ هایێ..) دەلەرێنەوە، ئەوەتا لە بن دوندەكەی ئەو بەرەوە، عەودال لە سەر بەردێ دانیشتووە، تەنبوورەكەی دەستی كە لە داری دار گوێزە، ژێیەكانی هەر ئەو ژێیەن كە گیانیان بەخشیە ئادەم و حەوا، سالحۆش بە پێوە پشتی بە قەدی دارەبەنێ داوە، دەستی چەپی خستۆتە بن گوێی، لە دەستی راستی تەزبێحێكی قەزوان، گوڵێنگەكەی دەڵێی گوڵە هەنارە، لەگەڵ هەر (هایێ..)یێ، دنكێ ئاوا دەكات:

هایێ، ل منێ هایێ

ئەزێ ب سەر شنگالێ داکەتم

نایێ ل من نایێ

دەنگێ کەژێ گەردن قورینگێ ل گوهێ من نایێ

کەژێ دەبینێ، دەبیستێ، ئەوەتا عەودال بە تەنبوور لە سالحۆ وەردەگرێتەوە، باڵدار و پەلکی داران لەگەڵیان دەلێنەوە و شنگالیان پڕکردووە، لە لاوك و ئاواز...

لە سەر پشتی مایینی شیرکی هاتە خوارێ و بە پێی با بەرەو لاوك و تەنبوور غاریدا، سە سپی کەوتە دوای، ئەوانیش بە دوای سەگەکەوە، کەژێ، بە دەم غاردانەوە:

سالحۆ، هاتم، کوڕۆ هاتم.

لە گەوەکە سەردەکەوێ، لە ملەکە ئاودیو دەبێ، سە سپی، بەر لەوەی بە دوایدا ئاودیو بێت، ئاوڕێکی لە دیرۆکزان و وان دایەوە، بە ئاماژەی سەر و کلك گۆتی:

وەرن، کەزی زەر لێرەیە.

کەژیٚ، بزری کردن، سالحۆ و عەودالی بزرکرد، بەڵام دەنگی لاوك و تەنبوور دیٚ، لە چالاّییەك لە سەر خڕە بەردیٚکی سپی، لە سپیێتیدا دەتگوت لەگەڵ سە سپی جمکن، بە دەوری خۆیدا دەخولیٚتەوە، نایانبینیٚ و روونیش نیە، دەنگ لە کیهە لاوەیە، ریٚك لە بایەکەی ئەو شویٚنە دەچیٚ کە گیٚژ دەدات و کەس نازانیٚ چ بایەکە و لە کویٚوە هەڵیکردووە، تاویٚ چاودەگ ریٚ، وا دیارە نائومیٚد دەبیٚت، بە ریٚی خۆیدا دەگەڕیٚتەوە، لە سەر بستیەك دادەنیشیٚ، سە سپی بە دەوریدا کلك بادەدا و بۆن بە لاق و رانیەوە دەکات، لمووز بۆ چەقۆکە دەبات، بەڵام زوو دەکشیٚتەوە، کلکی دەخاتە سەرپشتی، بەرە و ئەشکەفتەکە غاردەدات، وەك بڵیٚی هەواڵیٚکی خۆش بۆ گوڵەشلیٚرە و هەشتسمیٚلٚ بباتەوە.

کەژیٚ، گویٚی لە قسە و باسی دیرۆکزان و وان نیە، چاوی لە سەر چەقۆیە، دەڕوات، دەگاتەوە، پرا دەلال، لە خوار پردەکە، لە شانی سالحۆ دانیشتووە، دوای گیٚڕانەوەی سەربردەی پرد، سالحۆ بە دەنگیٚکی نەوی تیٚهەڵدەکاتە:

ئەز بۆ دەربازبوونا

کەژێ خۆ، کەژێ گەردن زەرێ، چاڤ ب خالێ

ل سەر هەمی زێیا

هەمی ریبارا

پشتێ خۆ دکەم پر، پرا دەلالێ

کەژێ....

کەژێ لەگەل سترانی سالحۆ، دوور لە چاوان دەچێتە باوەشی و لە ماچێکی قووڵدا دەفڕن، دەبنە تیتلە کناچەی سەر زێ و رووباران...

هەر لە گەشتە بەهاریەکەیە، گەشتی بن پردی دەلال، لەگەڵ سالحۆ، سالحۆی تازە دۆست، دەڵێی کۆتری سەر لیسێن سەریان بە یەك کردووە، پشت لە ناشیرینی و روویان لە جوانیە و جوانیەکانی دنیا دەگێڕنەوە، قسە دێتە جوانیی ناو ئاییینیش، گوتوبێژی ناسك دێتە گۆڕێ:

سالحۆ:

تۆ بە من بڵێ، ئێزیدی تف رۆکردنە سەر زەویان پێناخۆشە؟

کەژێ:

زۆر، زۆر

سالحۆ:

مامۆستایەکمان دەیگۆت: ئەگەر بتەوێ ئێزیدی توورە بکەیت، تف رۆکە، چوونکە لە کن ئەوان هەموو تفێك، تفکردنە لە شەیتان، شەیتانیش خودای ئەوانە.

کەژێ:

تۆش باوەڕت بە مامۆستا کرد، وا نە؟

سالحۆ بە پێکەنینەوە:

ئەدی باوەڕ بە مامۆستا نەکەم، بە کێ بکەم؟

کەژێ:

مامۆستای ئاواتان هەیە، بۆیە، ئێمە تا دێ لێکدی دووردەکەوینەوە.

سالحۆ بە سەر سوڕمانەوە:

من و تۆ؟

کەژێ بزەیەکی شیرین دەکات:

نا، ئێزیدی و موسڵمان دەڵێم.

سالحۆ:

چووزانم، بەوەی باشە من و تۆ نە موسڵمانین نە ئێزیدی.

کەژێ کەمێ خۆ گرژدەکات:

نەمگوت، واز لەو قسانە بێنە.

سالحۆ:

بە جوانیی خۆت بمبەخشە، هەڵەم کرد، دەی واز لەوە بێنە، بەڵام بە منت نەگوت، ئێوە بۆ هێندە رقتان لە تفە.

کەژێ:

تا ئێستا نەتزانیوە؟ بۆم باس نەکردوویت؟

سالحۆ دەیویست بیربکاتەوە و بیربیکەوێتەوە، کەژێ، بە ناسکیەوە هاتە قسە:

پاراستنی زەوی، پاراستنی سرووشت بەشێکە لە ئایینی ئێزیدی، زەوی بە تف پیس دەبێت، تفکردن، دەستدرێژیە بۆ سەر سرووشت، بۆیە بۆ خاوێنڕاگتنی زەوی، ئێزیدی بە تف نێوچەوان گرژ دەکەن، تووڕە دەبن، نەك بە هۆی شەیتان و مەیتانەوە، ئاخر ئەو شەیتانەی لە ناو قورئانێ هەیە، هەرچی

موسڵمانە بەرد وتفی تێدەگرن، لە ئاییینی ئێزیدا بوونی نیە، ئێزیدی هەر نایناسن، تا بیپەرستن.

ساڵحۆ:

ئەدی مەلەك تاوس، هەر شەیتانەكە نیە؟

كەژێ:

مەلەك تاوسێ مە، نە خودایە، نە دوژمنی خودایە، نوێنەرێ خودایە لە سەر زەوی، كارێ وی تەنها چاكەیە، هێندەی سەرە دەرزیەك خراپەی لێ ناوەشێتەوە، شەیتانەكەی ئێوە نیە، تەنها لە كرنووش نەبردەنەكە بۆ ئادەم وێكدەچن.

ساڵحۆ، نیگایەكی هێند تیژی لە چاوی بڕی، دڵی كەژێ لەرزی، گۆت:

مەلەك تاوس، ئەو چاكەم دەگەل بكە، وا بكە ئەو كچە بۆ من بێ.

كەژێ:

تۆ دەزانی واتای وشەی تاوس چیە؟

ساڵحۆ:

نازانم، بەڵام چ دوور نیە، بە واتای کەژێ بێ..

کەژێ:

مەیکە گاڵتە، دەزانی یان نا؟

سالحۆ:

نا

کەژێ:

واتە رووناهیی خودا.

سالحۆ:

ئەدی نەمگۆ، واتە کەژێ؟ تۆ تاوسی منی

دەستی گەیاندە پرچی کەژێ و چەند تیسکێکی خاوی بەنەرمی راکێشا، لەگەڵ راکێشانی پرچ، کەژێ لە بن پردی دەلال گەیشتەوە سەری شنگالێ، خۆی لە تەنیشت دیرۆکزان دیتەوە.

بە کەڤرەکەیدا هەڵگەڕا، دەستی چەپی بە ناو توورەگەکەیدا تەواوێ گێڕا و مۆبایلەکەی هێنایە دەرێ، تەواوێ لێی راما، بە سینگی خۆیەوە نووساند، بیری بە دەوری نامە نەخوێندراوەکەدا

دەخولێتەوە، ئەو نامەیەی چەند وشەیەکی لێخوێندەوە و کوژایەوە و نەیزانی لە کێوە هات، لە کەلێنی پەلکی هەنجیرانەوە، لە خودا پاڕایەوە و نزایکرد:

ئێزدی مەزن، با نامەکە لە سالحۆوە بووبێت.

وێنەی وایەرێك و پلاکێکی کارەبای هێنایە پێش چاوی خۆی و لە بەر خۆیەوە:

بایی نیو خولەك و وزە و بەس...

بە دەستی راستی لە سەر چۆکی خۆیدا، لەبیرینەمابوو چەقۆی لە دەستە، هێندەی نەمابوو، نووکی چەقۆ لە شلکەی رانی راچێ، چاوی لە مۆبایلەکەی بڕیوە، بیری لە سەر نامە نەخوێندراوەکەوە چوو سەر دوا نامەی سالحۆ، ئەو نامەی لە رەنگی دیارە، لە ناو گۆڕیش لەبیرناچێتەوە، ئەو نامەی برینێکە بن دەداتەوە و سارێژ نابێت، ئەو نامەی لە نزا باشتری ئەزبەرە، ناو ناوە بە ترسەوە بۆ خۆی دەڵێتەوە:

کەژێ، ل میسلێ، ل نزیك مەزاری نەبی یوونسێ، ئەز کەتمە دەستێ داعشان، نووکە دگەل شەش حەفت کەس لە ژۆرەکیان

کردینه، دڵم دەڵێ ڕۆژم تەواو و مردن دەگات، دوێنێ شەوێش خەوێکی ناخۆشم، دیت، کەژەکەم، تاوسەکەم، لەو دنیاش خۆشمدەوێی، تۆ ئاگات لە خۆت بێ، ئەوانە بگەنە شنگال، زارۆی ناو لانکیش سەردەبڕن، تۆدەکەنە کەنیزە، گەردنم ئازاد کە...

بە دیار وەبیرهاتنەوەی نامەکەی سالحۆ، هەندێ وردە ڕۆندکی داباراندە سەر مۆبایلەکەی، هەموو ئەو نامە بێ وەڵامانەشی بیرکەوتەوە کە لە دوای نامەکەی سالحۆ بۆی ناردەوە و چ هەواڵ نەهات، ئەو هەموو زەنگەی لە گوێ زرینگایەوە کە بۆ سالحۆی لێدا، هەموو بە (لە دەرێی بازنەیە) وەڵامدەدرایەوە.

کەژێ مۆبایلەکەی خستەوە ناو توورەگەکەوە و بە داریەوە کرد و بە چەقۆوە، نەرم نەرم بەرەو ئەشکەفتەکە چوو، گوڵەشلێرەش لە پێش سە سپی بەپیریەوە هات.

ڕۆژ لە سەر ئاوابوونە، ئاسمانی شنگال، دووکەڵ و تۆزە، زەردەپەڕی ئەو ئێوارەیە چ جوانیەکی تێدا نادرەوشێتەوە.

گوڵەشلێرە خۆی بە باوەشی کەژێدا شۆڕکردۆتەوە، لێناگەڕێ بۆ ماڵەکەی خۆی بچێتەوە، سە سپیش بە دەوریاندا دەسووڕێتەوە و کلك بادەدات، هەشتسمێڵ بە ئاماژە تکای مانەوەی لێدەکات، کەژێ وا دیارە دڵی نەرم دەبێت، کەمێك دوور لەوان دادەنیشێت و گوڵەشلێرە سەر بە کۆشی دەکات، سە سپیش لە بن پێی گوڵەشلێرە هەڵتووتکاوە.

دیرۆکزان لەگۆ رادیۆیە، هەواڵ هەر هەواڵی قڕکردنی ئێزیدیانە، مێرکوشتن و ژن و منداڵ بردنە، میلی رادیۆی لە سەر مەلایەك راگرت، دیاربوو بە دەنگ ناسیەوە، لە گوێی خۆی نزیککردەوە، کەمێ کزی کرد، مەلا بە زمانی کوردی، هاتە گۆ:

ئەوە کێیە دەڵێ، ئێمە لە رەچەڵەکی یەزیدیەکانین؟ شەکری خوارد، کێیە دەڵێ، ئەوانە کوردی رەسەنن؟ بە لە گوێی خۆی بدات، ئەگەر ئەوان رەسەن بن، من لێرەوە حاشا لە کوردبوونی خۆم دەکەم، چۆن دەبێ، بنەچەی ئێمە بۆ شەیتانپەرستان بگەڕێتەوە.

کوڕە کۆچۆیی دەڵێ:

دە، بیکوژێنەوە، من بەرگەی ئەو قسانە ناگرم.

دیرۆکزان، نایکوژێنێتەوە، کزتری دەکات:

برایانی موسڵمان، نەکەن سەرچیخ بچن و باوەڕ بەو قسە پووچانە بکەن، ئێمە و یەزیدیەکان، نە لە رابردوو نە لە ئێستا نە لە ئاییندە، لە هیچ شتێ بە یەك ناگەینەوە، شەرمە، بە خودا شەرمە کوردێکی موسڵمان بنەچەی خۆی بباتەوە سەر ئەو لە خودا یاخیانە.

ئەوانە بە خۆیان دەڵێن: یەکتا پەرستن، خودا پەرستن، کەچی شەیتانی ئیبلیس بە خودای خۆیان دادەنێن و ناویان لێناوە مەلەك تاوس، ئەو شەیتانەی کە لە خودای گەورە یاخی بوو و کرنووشی بۆ ئادەم نەبرد، ئەو پیسانە دەیپەرستن.

خوداپەرست چۆن دەبێت پیس بێت، ئەوانە نینۆکیان ناکەن، بستێ درێژە، شەیتان لە بن نینۆکیانە، ئەوانە دەبن و گەورە دەبن و پیر دەبن و دەمرن، گۆلە ئاوێك بە خۆیاندا ناکەن...

کۆچۆیی:

ئەو سەگبابە درۆزنە، نەکوژێنیەوە، لێرە دەڕۆم.

دیرۆکزان دەڵێ:

تووڕە مەبە، من دەڕۆم..

دەچێتە ئەو دیوی کەژێ، هەستدەکات، ئەویش دەیەوێ گوێیلێبگرێ، بۆیە زۆر کزی ناکات:

ئاخر ئەوانە جگە لەوەی خوانەناسن کوردیش نین، هەموو دنیا دەزانی ئەوەی یەزیدی کوڕی موعاویەن، هەڵگەڕاوەن، دوو جار هەڵگەڕاوەن، جارێك لە عەرەب، جارێك لە ئیسلام، تۆ، ئەی کوردی موسڵمان، ئەگەر ڕەچەلەکی خۆت ببەیتەوە سەر ئەوانە، کەواتە خۆت کردە عارەب، عارەبێکی لە خوا یاخی...

خۆ ئەگەر حاشاش لە عارەب بوونی خۆیان بکەن، ئەوە فارسن، خەڵکی شاری یەزدی ئێرانن، ئێ ناوەکەیان لە یەك لەو دوانە هاتووە، یان لە یەزیدی عارەب، یان لە یەزدی فارس، جا برای کوردی موسڵمان، تۆ کە خۆت دەبەیتەوە سەر یەزیدیەکان، کەواتە حاشات لە کوردبوونت کرد، خۆت کردە فارس، خۆت کردە عارەب، بەڵام تێبگە، تۆ موسڵمانێکی کوردی، نەك

یەزیدیەکی لە فارس و عارەب هەڵگەڕاوە، لە خودای مەزن هەڵگەڕاوە.

کوڕە، لەوەش گەڕێ، ئەها وشەی یەزدان بە فارسی واتە خودا، ئەو خودا نەناسانە، ناوی خودایان لە خۆیان ناوە، واتە ئێمە خوداین، هەی بەر غەزەبی خودا کەون، وەك کەوتن.

دیرۆکزان، لە سەر مەلای لادا، روو لە کەژێ، گوتی:

ئەو مەلایە، خەڵکی دەڤەری هەڵەبجەیە، لە هەولێرێ پێشنوێژی دەکات، مزگەفتەکەی بە بەر ناکەوێت، پێنج هەزار کەس لە دوای نوێژ دادەبستن

کۆچۆیی:

هیچوپووچ، ناکەسی لە ناکەسان، بۆچی وا لە ئێمە داخ لە دڵە، رەنگە وا تێگەیشتبێ، بە فەرمانی ئێزیدی هەڵەبجە کیمیا بارانکراوە و پێنج هەزاریان تیاچووە.

کوڕی روو بە ماچ، دیاربوو جوان گوێی دابووە، قسەی مەلا:

من لەوڕۆوە، تەنها ئێزیدیم، نە کوردم و نەهیچ.

دیرۆکزان:

دیرۆك شتەکە، مەلا تشتکەیدی، تۆش...

ئاهی هەڵکێشا و لە بەر خۆوە:

مەلای درۆ و نەزانی، مەلای داعشی، هەزار ساڵ بەر لەوەی باپیری ئەو یەزیدە عارەبە لە ناو بتانی بیابان چاو هەڵێنێ، زەینەفۆن، زەینەفۆنی گەشتی دەهەزارە، بێرەدا، بە بناری شنگالدا تێدەپەڕێ و باسی ئازایەتی ئێزیدیانی ئێزد پەرست دەکات.

هەر لەو سەرویەندە، ئەسکەندەری گەورە، لە ئێرانێ بەردی بناغەی شارێکی جوانی دانا، ناوی یەزدی لێنا، مەلای لە دیرۆك فش، ئێزیدی هەزاران ساڵ بەر لە یەزید و یەزد، ئێزیدین.

مەلای لە دیرۆك نەزانێ، ئەگەر ئێزیدی عارەب بان، کوڕێ بەتووتە، گەڕیدەی عارەبزمان، کە هاتە شنگالێ، چ پێویستی بە وەرگێڕ هەبوو، حەفتەك گەڕا، تا کوردێکی موسڵمانی عارەبیزانی دیتەوە، لە ڕێی ئەوەوە ئێزیدیانی هێنایە ئاخاقتنێ.

مەلا، ئێزیدی هەزاران ساڵ بەری موحەمەدیێ، بەریێ عیسا و موسا و زەردەشتیێ، ئێزدی مەزن دەپەرستن و بە زمانی کوردی پێیدا هەڵدەڵێن و لێیدەپاڕێنەوە:

سوڵتان ئێزید ب خۆ پادشایە

هەزار و ئێك ناڤ ل خوە دانایە

ناڤێ مەزن هەر خودایە

مەلا، مەلای کوێرەوار لە ئایین و زمانی ئێزیدیان، ئێزیدی باوەڕیان وایە:

زمانی بەهەشت، زمانی ئێزیدیانە، زمانی کوردیە.

گوڵەشلێرە خەوتبوو، کەژێ بە ئەسپایی هەڵیگرت و لە تەنیشت هەشتسمێڵی درێژ کرد، ڕۆیشت، سە سپی بەرێیکرد، لەگەڵی چوو تا گەیشتە سەر بەردەکە، لە گەڕانەوە تووشی دیرۆکزان بوو، لەگەڵ ویش گەرایەوە لای کەژێ، کاتێ دڵنیابوون کەژێ لە جێی خۆی پاڵکەوتووە، پێکەوە گەڕانەوە ئەشکەوتەکە.

دیرۆکزان، ئەو شەوە دڵی بەرایی نەدا، کچە بە تەنیا لەو جێیە چۆلە بمێنێتەوە، بزگورێکی هەڵگرت و چوو لە سەرێی گابەردەکە، جێی خۆشکرد و پاڵکەوت، رادیۆکەی کردەوە، هێندە دەنگی دایێ بگاتە گوێی کەژێ.

سە سپیش چەند جارێ رێی نێوان ئەشکەفت و ماڵی کەژێی کوتایەوە، بۆی یەك لا نەدەبۆوە، لای کەژێ بمێنێتەوە یان بچێتەوە لای گوڵەشلێرە، سە سپی ئەو هاتوچۆیەی شەوێی پیشەی خۆی بوو، لە نێوان ئەشکەفت و ماڵی کەژێ دەهات و دەچوو، دوا جار گەیشتە دوا بڕیار، چوو لە نزیك گوڵەشلێرە وەرکەوت، ملی لارکردەوە و گوێ قیتەکەی کەوتە سەر پێی گوڵەشلێرە.

کەژێ گوێی دابووە رادیۆ، ئەو شەوە باس هەر باسی فەرمان بوو، باسی کوشتن و بە تاڵان بردنی ژن و منداڵی ئێزیدیان بوو، لە بەرنامەیەکی راستەوخۆشدا، لە رێی تەلەفۆنەوە، کوردێك دەیگۆت:

یەزیدی کورد نین، چ کوردێ جلکی عارەبی لەبەر ناکات،

ئەوان کراسی شۆڕی عارەبیان لەبەرە، چەفیە و عەگالی

عارەبیان لە سەرە، زامانیشیان عارەبیە، ئەوانەی بە کوردیش

قسەدەکەن، زمانیان خوارە و من تێیانناگەم.

لە بەرنامەیەکیتر، عارەبێك دەیگوت:

یەزیدیەکان، کوردی گاورن.

لەو ساتە دەنگی رادیۆ نەما، کەژێش چاوب داخست و خۆی

هاویشتە باوەشی پیری چل چلەوەوە، سەربردەی ئێزیدی و

جلکی عارەبیشی بیرکەوتەوە.

## ئەز ئێزیدیمە

## ئەز بەهەشتیمە

لە وەڕینی سە سپی وەئاگاهات، چەقۆکەی لە ناو دەست نەمابوو، شەو لەبیریچووبوو دەسکەکەی بە ناو لەپییەوە گرێبدا، بەوە تۆزێ دڵگران بوو.

سە سپی، سەر بەردەکە کەوتووە، لە سەر سەری ڕاوەستاوە، هەند نەرم دەحەپێ، مرۆڤ حەزی دەچێتە حەپین، دەڵێی دایکە ناچارە و دڵیشی نایە منداڵەکەی وەئاگابێنێ، کەژێ لە سۆزی سە سپیەوە، دایکیی وەك تارمایی خەونێ بیرکەوتەوە، ڕەنگە

هەر خەونیش بووبێ، ئاخر ئەو ساڵەی دایکی چووە ئەو دنیا، گەلەك منداڵ بوو، پێناچێ باوەش و سۆزی وی وەبیربێت.

وا تێگەیشت شتێ قەوماوە، بۆیە سەسپی لە خەوی هەستاندووە، بەڵام بە سەر خوارکردنەوە و کلك بادان دڵنیای کردەوە، هیچ لە گۆڕێ نیە، دەمی خڕبوونەوە و نان خواردنە، سە سپی لە پێش کەژێ دەڕۆیشت، تا پێچیان کردەوە و گەیشتنە زارکێ ئەشکەفتێ، ناوە ناوە ئاوڕی لێدەدایەوە، لەوێ خۆی دواخست و کەژێ پێشکەوت، گوڵەشلێرە بە باوەشکردنەوەوە:

دادە، دادە...

غاری دایێ، لەو ساتە مێشکی خۆی گوشی تا وەبیری بێتەوە کە ئەویش لەو تەمەنەی گوڵەشلێرە و بەو جولانەوەیەوە دایە دایەکی بۆ دایکی کردووە، بیرینەکەوتەوە.

لە تەنیشت هەشتسمێڵ دانیشت، نانێکی باشیان خوارد، ئەو سبەینێیە چایەش هەبوو، کەژێ چاوی بڕیە سەر قۆریە و

پەرداخەکان، زاری هەڵێنا، بەڵام دایخستەوە، وێدەچوو ویستبێتی بپرسێ:

ئەوەش فڕۆکە هەڵیدا، یان لێرە هەبوو؟

لە ئاسمانێ گڕەی باڵەفڕان دێ، لە بنارەکانەوە قرمەقرمی تفەنگان دێ، کوڕە کۆچۆیی دەڵێ:

خەڵکێکی زۆر بە چیا کەوتوون و چەکداریشان تێدایە و بەرگریدەکەن و ناهێڵن داعش سەرکەوێ.

دیرۆکزان سەری (وایە)ی بۆ لەقاند، رادیۆکەی هەڵکرد.

ئەو کوڕەی تا ئەو ساتەش هەر لە باری حەپەسان دەژیا و تا نەیاندواندبا، زمانی نەدەگەڕا، گۆتی:

زۆری پێمەکە، با پاتری نەمرێ.

دیرۆکزان:

قسەی تۆیە، زوو دەیکوژێنمەوە.

کەمێ دەنگی دایێ:

داعش، ئایینی نیە، لە تیرەی مرۆڤ نیە، تەڕ و وشك بە یەکەوە دەسووتێنێ، ئەوەی لەگەڵی نەبێت، ملی پەلدەدات، ناپرسێ، ئەوە ئێزیدیە، عیسایيە، مووساییە، محەمەدییە...

کوڕەی روو بە ماچ:

وای لەو شینە درۆیە، ئەدی لۆ ئێزیدی بە زۆر دەکەنە موسڵمان؟

دیرۆکزان:

راستە هەر کێ لەگەڵیان نەبێت، ملی پەلدەدەن، بەڵام ئەوەش نیە، ئاینیان نەبێ، ئەوانە زادەی ئایینن، تیرەی دەرێی ئاین نین، لە دیرۆکەوە هاتوون و دەپەڕنەوە ئایندەش...

بردیە سەر ئێستگەیەکیتر:

ئێستا نیازی گڵاوی داعش دەرکەوت، بە خوێنی کورد تینووە و تەواو، جا چ ئێزیدی بێ، چ زەردەشتی و جوولەکە، چ یارسانی و کریستانی و موسڵمان..

کوڕەی روو بە ماچ:

بەڵام فەرمانەکە، فەرمانی سەر ئێزیدیان، تایبەتە و قڕکردنمانە.

ئەو کوڕەی بەو سبەینێیە زمانی کەوتە زاری:

ڕاستە.

کوڕەی حەپەساو، کوڕەی کەمدوو، ئەوەی تا ئەوڕۆ شەرمن، لە ژووژك شەرمنتر، بەو سبەینێیە، کوڕێکیترە، کوڕێکە لە چاویڕا دیارە، دەیەوێ گرتەیەك لە سەربردەی شنگال نیشانی نەشکەفتنشینان بداتەوە، دەست بە ناو جانتاکەیدا دەگێڕێ، وێنەیەك دەردەهێنێ، هەشتسمێڵ بەر لە هەمووان چاوی دەکەوێتە سەر وێنەکە، بە ئاماژە و سەرسوڕمانەوە:

ئەوە چیە؟ بۆ لای تۆیە؟

لەگەڵ وێنەکە ناسنامەیەکیشی بە دەستەوە، دەڵێ:

ئەوانەم لە بەرکی ئاڵاڕەشێ دەرهێنا.

هەموو بە چاوی پرسیار و سەرسوڕمانەوە لە کوڕەیان ڕوانی، ناسنامەکە نە کوردی بوو، نە عەرەبی، نە ئینگلیزی، بۆیە تەواو بۆیان نەخوێندرایەوە و تێینەگەشتن، وێنەی سەر

ناسنامەکەش لە عارەب نەدەچوو، هەرچی ئەو وێنەیەیە کە گشتیان ناسیانەوە، ئەو پیاوەیە کە نیازی زیندووکردنەوەی ئیمپراتۆری ئۆسمانیانە، ئۆردۆگانە، هەوە، ئەوەی لە لاتیەوە لە ئەتاتورك دەچێ، لە رووەوەش سلێمان خانی قانوونیە.

-باشە وێنەی ئەو پیاوە، چ دەکات لە بەرکی ئەو تیرۆریستە؟

-رەنگە بە هەڵە هەڵیگرتبێ.

-نا، رایەڵێ هەیە.

- ئەو رایەڵەی بکوژ و زۆردارانی دنیا بەیەکەوە دەبەستێتەوە؟

-لە بنی دنیاوەش فەرمانێ دژ بە ئێزیدیان، دژ بە کوردان دەرچێ، تورك دەستێکی تێدایە.

هەر یەکەو شتێکی گۆ، کورەی کەمدوو:

ئەگەر ئێستا مۆبایلەك و خەتی ئینتەرنێت هەبا، وێنەم بە دنیادا بڵاودەکردەوە.

کەژێ بە بیستنی مۆبایل دەستی بۆ بەرکی برد، پێدەچوو لە مۆبایل بگەڕێ، بە هەناسە ساردیەوە، دەستی کێشایەوە.

دیرۆکزان:

بە چی دەچێ، با بلاویشببێتەوە، ئێمە وا بە بەرچاوی دنیاوە، مینا مەڕ سەردەبڕێین، بە بەر چاوی دنیاوە هەتکدەکرێین، دەڕفێنرێین، دەفرۆشرێین، کۆیلە دەکرێینز...دنیا، کوێرە، نابینێ، کەرە، نابیستێ، لاڵە متەقی نایە.

لەو ساتە چاوی کەوتە سەر هەشتسمێڵ و لێوی خۆی گەست و پێدەچوو لە گۆکردنی وشەی (کەڕ و لاڵ) پەژیوانبووبێتەوە، لە کوڕەی پرسی:

ئەوانەت چۆن دەستکەوت؟

کوڕە، ئەو پرسارەی لە خوا دەویست، بە زمانێکی حەکایەتخوانی:

ئەز لە لای سەرای کەتمە دەستی ئالاڕەشان، پرسیان:

+موسڵمانی یان شەیتانپەرست؟

_موسڵمان

+ دەی شادە بێنە

-ئەشهەد و ئەن لا ئیلاهە الە لا وە ئەشهەد و ئەنە موحەمەد رەسوولە لا.

کورەی روو بە ماچ، هاواری کرد:

+ ئەتو لە ترسان بوویە موسڵمان؟

-نا

+ ئەدی؟

-تۆ پەلەت نەبێ، ئالارەش گۆتی:

وەرە نوێژ دابەستە.

گۆتم:

لەو گۆڕە؟ ئێرە نوێژی لێ نایە.

زللەیەکی لێدام، سێ چار جار لە دەوری خۆم سووڕام، گۆتی:

گاور، تۆ من فێردەکەیت، کوێ نوێژی لێدێ؟

شمشێری هەڵکێشا:

دەکەیت یان ملت پەلدەم؟

گۆتم:

سەر چاو، چەند ركات بكەم؟

گۆتی:

هی نیوەڕۆ بكە و بە دەنگی بەرزیشەوە.

نوێژم دابەست، چوار ركاتم بە دەنگی بەرز خوێند.

كوڕی روو بە ماچ بە هەر دوو دەست لە سەری خۆی دا، بە مەیلەو گریانەوە:

نوێژی ئەوانیشت، كرد، ئەدی موسڵمانبوون كووە؟!

دیرۆكزان گوتی:

كوڕە دە لێی گەڕێ، كوڕە با قسەكانی تەواوبكات.

ئالاّرەش زانی موسڵمانم، بەلاّم گلی دامەوە و لە پاڵ دیوارێكیان راگرتین .

كوڕەی روو بە ماچ:

چما، تۆ موسڵمانی، ئێزیدی نی؟

كوڕە:

نا، من ئێزیدی نیم.

كوڕەی روو بە ماچ، هەناسەیەكی ئۆخەی هەڵكێشا و گوتی:

دەی کریڤۆ، بگێڕەوە.

کوڕە، لەو ساتەوە ناوی بووە کریڤۆ، هەموو سەیریان کرد، کەسیان نەیانزانیبوو، موسڵمانێکی هاوزمانیشان لەگەڵە و بە چل مێرا کەوتووە، کەژێ کە بیستی موسڵمانە، بە تیلەی چاو جوان سەیری کرد و لە سیمای ئەوەوە بۆ چەند ساتێ، سالحۆی هاتەوە بەر چاو و گەڕایەوە سەر رووباری دەچلە، بەڵام گێڕانەوەی کریڤۆ، هێنایەوە ناو ئەشکەفتەکە:

گوێم لێبوو، شمشێریەدەستێ، لە زمانیڕا دیاربوو، عارەبی نەیناوایە، بە شمشێریەدەستێکیتری دەگۆت:

کورد هەر کوردە، چ ئێزیدی بێ، چ موسڵمان، گاوری سەر کۆن و کوشتنیان غەزایە.

ئێ، پیرێکیان لە ناو ئێمە دەرهێنا، جلکی عارەبی لە بەر بوو، لە سەر و سمێلیش، هێندە بە ئێزیدیان نەدەچوو، هەندێ قسەیان دەگەڵ کرد، گوێم لێبوو، دەیگۆ:

ئەز عارەبی نزانم

دایانە بەر شەق و شوڵاق، ئەو هەر هێندەی دەگۆ:

ب خودێ ئەز عارەبی نزانم

ناچار وەرگێرێکیان هێنا.

+تۆ ئێزیدی یان موسڵمانی؟

-ئەز ئێزیدیمە

+ تۆ کوردی یان عارەبی؟

_ ئەز ئێزیدیمە

+پیرە سەگ، پرسیاری ئایینت لێ ناکەم، نەتەوەکەت چیە؟

-ئەز ئێزیدیمە، ئێزیدی

+ئەگەر عارەب نیت، بۆچی چەفیە و عەگالی عارەبیت، لە سەرە

-خودێ عارەبی بەرێ بگرێ.

+دەبیە عارەب؟

-نەخێر ئەز ئێزیدیمە.

+ پیرە شەیتانپەرست، زوو وەرە سەر ئایینی پیرۆزی ئیسلام و خودا و محەمەد بناسە، شادە بێنە.

_ ئەز شەیتان ناسناکەم، خودێی تاك و تەنیا دەپەرستم، محەمەد پێغەمبەرێ هەوەیە، یێ مە نیە.

+ کەواتە نابیە، موسڵمان؟

- ئەز ئێزیدیمە.

+ تا حەفتان دەژمێرم، یان شادە هێنان، یان بەرەو دۆزەخ تێهەڵدان؟

-ئەز ئێزیدیمە، ئەز بەهەشتیمە

خودانی ئاخرەتی و دنیێ

حاسل مرازا منێ

یەزدانی من، یی ب تنێ

ئەز ئێزیدیمە و لە ترسێ شیر و تیرا، چو جارا دینێ خۆ ناهێلم.

بە بەر چاومەوە سەری پەڕی، ئەز سەرپەڕینم نەدیتبوو، لە فیلمیش تەماشام نەکردووە، سەربڕینی مەڕ و ماڵات و پەلەوەریشم نەدیتووە، تووشی سەرسوڕە هاتم، کەوتمە بارێکی وا، ناهێتە ڤەگێڕان، دیتم بە چاوی خۆم دیتم، سەری پەڕیو، لە

ڕۆخ جادە دەڕۆیی و هەڵبەز و دابەزی دەکرد، وەك ئەوەی حاڵی گرتبێ، بە گوێی خۆم گوێم لێبوو، سەری پەڕیوی حاڵگرتوو، بە دەم ڕێوە، ناسك ناسك، بە ریتم، وەك ئەوەی لەگەڵ تەنبوور بیلێتەوە، دەیگۆتەوە:

ئەز ئێزیدیمە، ئەز ئێ زی دی مە

ئەز ئـ ێ ز ی د ی م ە

سەر دەڕۆیی و (ئێزیدیمە)ی دەگۆتەوە، سێ چار ئاڵاڕەش، سەری زار پڕ ئێزیدیان دا بەر فیشەکان، سەیر بوو، شتی وا، وا بە چاوی خۆشم دیم، بەڵام باوەڕناکەم، لەو هەموو دەستڕێژە، گوللەیەك چیە بە سەری حاڵگرتوو نەکەوت، دیتم سەری ئەو پیرە هەشتا نەوەت سالیە، وێنەی بەرخۆلەیەك کە بە ناو قەرسیلا غاربدات، وا غاری دەدا، ڕێی چیای گرت، بە شنگالدا هەڵگەڕا، لە چاویش بزربووبوو، هێشتا زایەلەی (ئەز ئێزیدیمە) دەهات، ئێستاش لە گوێمدا دەزرینگێتەوە، لێرەیە، سەری پەڕیوی پیرەکەی شنگالێ لێرەیە، دەیبینمەوە، تا دەمرم بە

دوایدا دەگەڕێم، سەرەکە لە چل مێرایە، بزانە لە بن چ بەردێ، چ بنە دارێ، ئێستاش (ئێزیدیمە) دەڵێتەوە.

هێند بە دڵنیاییەوە سەربردەی سەری دەگێڕایەوە، هەندێکیان سەریان هەڵبڕی، چاویان لە سەری پەڕیو دەگێڕا، کەژێ هەستا بڕوات، بەڵام تێهەڵچوونەوەی کریڤۆ، رایگرت و نەختێ لەو لاتر داینشاندەوە:

کوڕێکی گەنجیان هێنا، خوێن لە زار و کەپوویەوە دەهات، دەستێکی بە خۆیدا شۆڕکردبۆوە و نەدەجوولایەوە، پێدەچوو شکابێت، پرسیان:

+ دەبیە موسڵمان؟

-بەڵێ

شادەیان پێهێنا، هەندێ شتیان پێگۆتەوە، هەر کابرای موسلاوی گۆتی:

کورد بەرماڵیشان لە سەر ئاو بگەڕێ، هەر گاورن و پاکنابنەوە و نابنە موسڵمان.

شیربەدەستێکیدی رووی لە ئێزیدیە موسڵمانەکە کرد و داوای لێکرد، جوێن بە مەلەك تاوس بدات، کوڕ زاری هەڵنەهێنا، چەندی داوایان لێکرد، لێیاندا، ورتەی لێوە نەهات، شیربەدەستی موسڵاوی، روو لە ئاڵارەشەکەی هاوڕێ:

نەمگوت!

پیلیان گرت و هەڵیاندایە ناو ترومبێلێکەوە، نەمزانی، چارونووسی بە چی گەیشت، ئێمە کە سێ چوار کەس مابووینەوە، ئێزیدیمان تێدا نەمابوو، رایانپێچاین، لە دوکانێکی سەر سووچێکی دەراب شکاویان کردین، چەکدارێکی کەتەی چوارشانەش بە دیارمانەوە.

بەرە بەری ئێوارەیە، لەو جادەیە، قیژە و زیرەی ژن گوێ کاسدەکات، دیاربوو، راپێچیان کردبوون و نەمزانی بۆ کوێیان دەبردن، دنیا لە سەر تاریکبوونە، ترسم لێنیشت، هەستمکرد ئەو هەڕەشەی لە سەر ئێزیدیانە، لە سەر منیشە، ئاخر بیستبووم، بەری چەند رۆژێ، بۆ چاوترسێنی نەیارانی خۆیان، لە

نزيك نەبی یوونسی نەیناوا، سەری کوردی موسڵمان و ئێزیدییان لە شێوەی سەرە بەران بە تەنیشت ئێکترەوە هەڵواسیبوو...

کەژێ بە بیستنی نەبی یوونس و سەری ئێزیدی موسڵمان، راچڵەکی، هەموو هەستیان بە راچڵەکینەکەی کرد، کەژێ، بۆ ساتێ وێنەی سەری سالحۆی بە هەڵواسراوی دی، خوێنی لێ دەچۆڕایەوە، چاوی داخست و رۆیشت، بە دەنگی کریڤۆ هاتەوە ناو ئەشکەفتەکە:

بۆیە بڕیاری خۆم دا، سەرم خستە بن گوێی یەکیان:

+وا چاکە، هەڵبێین.

-بەڵام بۆ کوێ؟ هەموو سەرە کۆڵانێ داعشە، دەوری شاریان داوە

+نازانم، بەڵام من هەڵدێم.

ئەوانیتریش تێگەیشتن کە نیازی هەڵاتنم هەیە، رێککەوتین، شتێ بکەین، کوڕێك پێدەچوو وەرزشوان بێ، زۆر بە هێز دیار بوو، گوتی:

بۆ منی لێگەڕێن.

شووشەیەکی بیبسی دەستدایێ، تەزردەستانە، پەلاماریدا، لە پشتە سەری چەکداری دا، ئەو زەلامە کەتەیە، بێئەوەی ئاخی، هاوارێکی لێ بەرز بێتەوە، تەختی زەوی بوو، کەوتە لرخەلرخ، هێواش بە دوای ویدا هاتینە دەرێ، شووشە وەشێن تفەنگەی کردە شانی، یەك شمشێرە کورتەکەی قەدی لێکردەوە، منیش دەستم لە باخەڵی گیرا، ئەوانەم دیتەوە، بە پێدزە و ماتە مات، تێدامابووین، روو لە کوێ بکەین، ئالاڕەش لە هەموو جێ دەنگیان دێ، (الله اکبر الله اکبر) شنگال دەهەژێنێ، لە قەراخ شار ئاشکرابووین، کەوتینە ناو تەقە، لێکدی دابڕاین، کەسیانم نەدیتەوە، من رێی چیام گرت، نازانم ئەوان بەرەو کوێ چوون، من ئەو رێیەم گرت، کە سەری حاڵگرتووی پیرەکەی پێدا سەرکەوت، هەستمکرد، رێ رێی ئەوە، بە دوای دەنگەکەدا هاتم، باوەڕتان بێت، تا گەیشتمە ئێرە، لە پێش منەوە، ناوە ناوە گوێم لە دەنگی پڕ ئاوازی دەبوو:

ئەز ئێ زی دی مە...

کەژێ بەرزەپێ هەستا، هەشتسمێڵ بڕێ شتی گۆ، لێ کەس تێیەنەگەیی، ناچار رووی لەوان وەرگێڕا و بۆ لای گوڵەشلێرە چوو، پێدەچوو، ئەو دووە باش تێگبکەن، گوڵەشلێرە هەر لێوی جوولابا، ئەو دەیزانی چی دەوێ و چی دەڵێ، گوڵەشلێرەش جوان لە ئاماژەی ئەو وردەبۆوە، هەر جوولەیەکی بە دەست و چاو برۆ و لێوی کردبا، بزەیەکی شیرنی بۆ دەکرد و دەیگۆ:

باسە، باسە..،

کریڤۆ پێدەچوو، هێشتا زۆری لە دڵ مابێ، هەڵێڕیژێ، بەڵام وا دیارە، کەس توانای گوێگرتنی گێڕانەوەی شنگالی ئێستای نیە..

کەژێ لە پێچەکە سووڕایەوە، سەرێکی لە ماڵەکەی خۆی دا، سەیرێکی مۆبایلەکەی کردەوە، داینایەوە، بە چەقۆوە، بە لووتکەدا هەڵگەڕا، لەو سەرە پرچی کردبۆوە، لە خوارەوە تەماشاتکردبا، دەتگوت ئاڵایە دەشەکێتەوە، لەوێوە بە دەنگێك سەد سوێندت دەخوارد لە تەنبوورەوە دێ:

مامۆ، تو لە کودەرێی؟ سالحۆ تو لە کودەرێیێ؟ عەودال تو لە کودەرێی؟

کەسیان سالحۆ ناسناکەن، ناشزانن، مامەکە کێیە، بەڵام هەموو عەودالی تەنبوورژەن دەناسن، ئەوەی لە بن منارەی بانگەوازیێ کردیانە سیێ چوار پارچە، تەنبوورەکەی بە بەرچاوی دیرۆکزانەوە، بە شنگالدا هەڵگەڕا و ئێستا وا دێتە گویێ کەژیێ.

کەژیێ لەو بەرزاییەوە، لە سەرەوەی رەوەزە شاخیێ، کە دەڵێی ژەنگ لێیداون، بە دەوری خۆیدا دەسووڕێتەوە، باڵەکانی لێکدەکاتەوە، پێدەچیێ داوا لە خودا بکات، باڵی لێبڕسکێنیێ، تا لە شەقەی باڵ بدات.

نا، نایەویێ چل مێرا بە جێبێلیێ، ئەوەتا هاتە خواریێ و چاو دەگێریێ و گوێهەڵدەخات، دەگەڕیێ و دەیەویێ بیانبینێتەوە، ئەو دڵنیایە هەرسێکیان لێرەن، گوێی لە دەنگیانە.

دێتە خواریێ، بە چەقۆ راوەشاندنەوە، بەرەو شوێنی خوێندنەوەی دیرۆك هەیەی لێدەکات، رێك لە جێی خۆی، سێبەری داربەڕووەکە، جێی خوێندنەوە رادەوەستیێ، چاو دەبڕێتە

تاشەبەردێ، تۆ چۆن ئێرە، ئەو سەربردەیە دەخوێنیتەوە، ئەویش وا، بەڵام بەدەنگێك، دەڵێی كۆتری بریندارە دەناورێتەوە:

ئەودولمەجیدی ئۆسمانی لە سەر تەختی سوڵتانە و دەسەلاتدارە، والیی نەیناواش، محەمەد ئینجەی بیرقەردارە، ئەو ساڵە لە دەڤەرێ شنگالی نەهات بوو، ئاخر چەند ساڵ بەرێ، كەوتبوونە بەر كوشت و بڕێ، نیوەی ئیزیدی تیاچووبوون، خاكی شنگال سووتماك بووبوو، بۆیە، لە دانی سەرانە كەمێ دواكەوتن، والی نەیناوا لە دوای ناردن، حەفت میری ئێزیدی، بۆ رێككەوتن و ئاشتەوایی، رێی كۆشكی والی دەگرنە بەرێ..

والی تومەز فەرمانی سوڵتانی پێیە، دەمێكە بۆ كوشتنیان لە سەر پێیە، لە دەروازەی كۆشكێ، لەشكر دەوریان دەدەن، میرانی ئێزیدی دەستدەكەنەوە، بەڵام بە چی دەچێ؟ هەر حەفت میر، دەهێنە كوشتنێ، والی بە كوشتن واز ناهێنێ، وەك نێریە كێوی سەریان دەبڕێ، هەر حەفت سەر بە دەروازەی شارەوە، چەند شەقاوێ لێك دوور، لە یەك ریز، هەڵدەواسێ، حەفت شەو و رۆژ، سەری میرانی ئێزیدی با لێیان دەدات و دلۆپ دلۆپ،

خوێنیان لێ دەچۆڕێ، دوای حەفتەیەك لە لێکردنەوە و فڕێدانی سەرەکان، لە شوێنی چۆڕاوگەی خوێنێ، حەفت نەمام دەڕوێن، هەواڵ دەگاتە والی، فەرمانی هەڵکێشانی نەمامان دەدا، حەفتەیەك نابات، دەڕوێنەوە، دیسان لە ڕەگەوە هەڵیاندەکێشن، دیسان دەڕوێنەوە، والی و لەشکر ساڵ و شتێ بە حەفت نەمامەکەوە خەریکدەبن، لە کۆتایی بێزار دەبن و واز دەهێنن، والی گۆتبووی:

کورد بە ئێزیدی و موسڵمانەوە مووی کونە لووتن، نابڕێنەوە.

نەمامەکان دەڕسکێن و پەل و پۆ بۆ ئاسمانێ دەهاوێژن، پەلکیان لە بن تیشکێ ڕۆژێ، سۆر سۆر دەچێتەوە، خەڵکی نەیناوا ناو لەو درختانە دەنێن:

درەختی خوێن

درەختی خوێن، تا دوا ئۆسمانی لە نەیناوا مابوو، تا دوایان بڕا، بە ریز وەستابوون و تەڕ تەڕ سۆردەچوونەوە.

کەژێ لە خوێندنەوەی دیرۆکی ئێزیدیان ناکەوێ، کەسیش قسەی پێنابڕێ:

کچم، بە عارەبکردنی، دەڤەری شنگالێ هی ئەورۆ نیە، هی سەروبەندی بە تورکمان کردنی قەلاتێ هەولێرێیە...

دیرۆکزان دەلێتە، کوڕی روو بە ماچ:

+ئەوە دەلێی قسەی کەسێك دەگێرێتەوە!

-ئەو کچە دین بووە

+نا، دین ناتوانێ بەو شێوە دیرۆك بگێڕێتەوە.

کەژێش کەمێ راوەستا، هەستیکرد، قسەی پیری چل چلەی مامی دەلێتەوە، دەستپێکردەوە:

سولتان هەر سولتانە، پاشای بەغداییش، رەشیدە، کێیە، هەر لە بن فەرمانی سولتانی ئۆسمانیە، ترکی ئۆسمانی لە عارەب تیرتر، ئاپینی خستۆتە خزمەتێ زمانێ خۆ، ئەگەر لە دەستی بێ، زمانی خۆی دەکاتە زمانێ هەردوو دنیا، چاوی بە چ میللەت و زمانان هەلنایە، نەخاسمە ئێزیدی و خاك و زمانێ

وان، زمانێ کوردی، بۆیێ لەوەتەی هەیە، لەهەولێ سڕینەوەی دایە.

سولتانی ئۆسمانی ویستی ماڵە تورك بە سەر خاکی ئێزیدیان هەڵڕێژێ، لێ نەبوو، هێندە ترکە لە کوێ بێنێ، لە سەر خاکی چەند خەڵك بیانچێنێ؟ ئاخر هەینێ ترك کەم بوون، هەر هێندەی ئێزیدی دەبوون، بۆیێ، ڕێیدا عارەب بێ، پاشای بەغدایێ، لە بنی دنیاوە، لە بیابانی قاقڕەوە، لە زێدی عومەرەوە عارەبی هێنا، بەریدانە بەری نەیناوا، بەری شاری شنگال و چیای شنگالێ..

هەردوو بەری نەیناوا، بەر لە هاتنی لەشکری بیابان، بۆ دەرمان عارەبت تیا نەدەدیتەوە، ئەوەی هەبوو، ئێزیدی بوو، جوولەکە و فەلە بوو، لەو سەردەمەوە، قل قلە عارەب دەهات، بەڵام لە ئۆسمانیەوە، لە دوای سوڵتان عەودلمەجیدەوە، گوڕیان کردێ، لە دەڤەرێ شنگالێ، هەر ئێزیدیەکیان دەکوشت، هەر ئێزیدیەکیان هەڵدەدایە ئەو سەری دتیا، بەری کێوی قافێ، ماڵە عارەبێك دەگەیشتە سەر هەوار و ماڵێ.

کەژیێ برژانگی بە تیشکی ڕۆژی سەر تاشەبەردان گرێداوە و لێنابێتەوە، گەرم داهاتووە، دەخوێنێتەوە وئاگای لە کەس نیە و لە دنیا دابڕاوە، لە هیکەوە، دەستێك دەیگێڕێتەوە سەری شنگالیێ، سەر نەوی دەکات، دەبینیێ گوڵەشلێرە لە بەردەمی ڕاوەستاوە و چاو بە گریانەوە سەری هەڵبڕیوە، پشت لە پەڕەکانی دیرۆك دەکات، منداڵە لە باوەش دەکات، ڕێی ماڵە هەنجیریەکەی خۆی و ئەشکەفتەکە دەگریێ، ئەوانیدیش بە دوایدا، دیرۆکزان دەڵیێ:

ئەو کچە دیرۆکی ئێزیدیانە، دەبێت بینووسینەوە و بیپارێزین.

ڕۆژ لە سەر ئاوابوونە، بەردەمی ئەشکەفت زەرددەچێتەوە، کوڕیژگە هەر لە خەوێیە.

## کریڤۆ، خایەنۆ

## بە کۆتربوونی زارۆ

خودێدە، خودێدە، هەستە، ئەورۆ رۆژت نەدی، نوێژت چوو، شەوت لە شەو گرێدایەوە.

کوڕی روو بە ماچ وا گازی کوڕە هەمیشە خەوتووەکەی کرد، بەڵام پەشیمانبۆوە لە بەئاگاهێنانەوەی، ئاخر لە شێوەی نێریە کێوی راپەڕی و لەو سەری ئەشکەفتێ ئەو بەردە قیتە گرتیەوە، کە زۆر شێوەی زەلامی دەدا و دەتگوت ئێشکگری ئەشکەفتێیە، بەردەکە گرتبوویەوە هێشتا خەونەکە بەرینەدابوو:

مندالەکە فڕی، مندالەکە فڕی.

هەشتسمێل لە سەری خۆی دەدات و گوڵەشلێرەش خۆی هاوێشتە ئامێزی کەزی زەرێ، چوون هێنایانەوە، ئاویان دایێ و هێوریان کردەوە، ئەو کوڕە، ئەو خودێدەیە، لەوەتەی بە چل مێرا کەوتووە، تووشی دەردی خەو بووە، تەنها لە دەمی نوێژ و جەمەکان بە ئاگایە، هەر جارێکیش لە خەو رادەبێ، پڕدەداتە گوڵەشلێرە و هێند توند دەیگوشێ، خۆی رادەپسکێنێ و لێی دوور دەکەوێتەوە، تەنها لەو هەستانەوەیە، ئاگای لە منداڵەی بن دەستی نەما و بەرە و منداڵە فڕیوەکە فڕی.

لە ناو بە چل مێرا کەوتووان، تەنها دیرۆکزان خودێدەی دەناسی، بەڵام نەیدەزانی چۆن گەیشتۆتە ئێرە و خێزانەکەی بە دەست فەرمانەوە چیان بە سەرهاتووە، هەرچی خودێدەیە، دیرۆکزانی نەدەناسیەوە و پێی شك نەدەهات دیتبێتی، چەند رۆژە چەندی هەوڵیان لەگەڵ خودیدە دەدا، سەربردەی خۆی، شتێ لە دوا فەرمان بگێڕێتەوە، سەری بادەدا و زاری هەڵنەدەهێنا، بەڵام ئەو ئێوارەیە خەونەکە خێری دایەوە و زاری خودێدەی کردەوە، دیرۆکزان گوتی:

ئەز دزانم تۆ خەڵکی ئاوایی هەردانی، بێژە...

خودێدە:

ئەرێ، ئەز لە ئاوایی حەردانەوە هاتم، رۆژی پێشی، ترومبێلەك هات، ئالای رەشی بە سەرەوە بوو، چوار پێنج چەکدار دابەزین، یەکیان بە عارەبی قسەی بۆ کردین و گۆت:

ئەم دوژمنێ بابەکوشتەی پێشمەرگەین، هی شیعەین، هەقمان بە سەر ئێزیدیانەوە نیە، ئێمە دەزانین ئێوە زیانی مێروولەشتان نیە...

هەندەك وێنەیان دەگەڵ گرتین و چوون. لێ بابم باوەڕی نەهات، گۆت:

کوڕێ من، بزانە، ئەوە فەرمانە، بۆ سەر و مالی ئێزیدیانە.

ئەز و دایك و بابێ خۆ دەرکەفتین، هاتینە گوندێکی نزیکە وێ، چووینە مالی کریڤێ خۆ، ئەو کریڤە عارەبێکی موسڵمان بوو، ئەز لە ناو کۆشێ وی، هاتیمە سونەتکردنێ، خۆمان دەخیلی کریڤ کرد، کریڤ پیچەك کوردی دزانی، گۆتە بابێ من:

مردن و ژیانمان پێکەوە، لە ژۆرێ مەهێنە دەرێ، با کەس نەتابینن.

ئێوارێ خواردنێکی باشیان بۆ کردین، رانە مریشکی خۆمانە، کراشەی دەکرد.

خەوتین، بەرەبەیان، لەگەڵ گارەگار، بە ئاگاهاتم، بابم گوتی:

کوڕم تۆ عارەبیت باشە، وەرە گوێبگرە، پێبکەوە لەو دیوە چ باسوخواسە؟

بابم لەوەتی هەیە، چەفیە و عەگالی لە سەرە، کراسی عارەبی لە بەرە، لێ سێ رستەی عارەبی نازانێ.

گوێم بە دەرگاوە نا، کەسێ دەڵێتە کریڤ:

ئێمە لە چاکەت دەرناچین، خودا چاکەت بداتەوە لە سەر ئەوەی ئەو گاورانەت رادەستی ئێمە کرد.

گۆتمە بابم:

بابۆ، کریڤ ئێمەی فرۆت.

دایکم مستێکی توندی لە سینگی خۆی دا، ئێستاش زرچەکەی لە گوێمە، بابم گۆتی:

کوڕم، هەڵەی، کریف ناپاکیم لەگەڵ ناکات.

بابم قسەی تەواونەکردبوو، دەرگا کرایەوە، سێ چوار چەکدار وەژۆر کەوتن و بە شەقوشولاق رایانپێچاین، بابم هاواریکرد:

کریفۆ، هەی خائینۆ...

کریف خۆی نیشاننەداین، ئاوایی پڕ بوو لە ئێزیدیی دەستبەسەر، هەر زوو مێرك و ژنك و و زارۆیان لێك هاوێرکرد، ئەز لە بابیشم دابڕام، سواریان کردین و بڕۆ.

خودێدە قوڕگی پڕ گریان بوو، رستە لە زاری خنکا، هەشتسمێڵ دیاربوو بە لێو جوولان و گریان تێگەیشت سەربردەی ئێزیدیان دەگێڕێتەوە، چوو دەستی بە سەردا هێنا و بە ئاماژە پێیگوت:

بگری، زۆر بگری، گریان باشە.

خودێدە گریا، تێر و پڕ گریا، سە سپیش گریا، گوڵەشلێرەش گریا، لەوەیە چیاش فرمێسکی لەگەڵیان داباراندبێت، پاش وەستانی فرمێسك، خودێدە هاتەوە سەر خەتی گێڕانەوە:

له چوارڕیانی هەردان، گوندێك کوڕ و پیاوی ئێزیدیان پشت له جاده ڕست کردبوو، چاوم گێڕا بابم بناسمەوە، لەو ساته قرمژنی گولله دنیای پڕکرد، نازانم له چەند تفەنگەوە گولله به سەر ئێزیدیاندا باری، له چاوترووکانێکدا هەر هەموو کێل بوونەوە، بابی خۆم نەناسیەوە، لەگەڵ ئەوانه بوو، نەبوو؟

سەرم لەوە سوڕمابوو، بۆچی منیشیان لەگەڵ ئەوان ڕست نەکردبوو، هەر لەوێ له ناو ترۆمبێلێکی سەر کراوە، که پڕی ژن بوو، دایکمم ناسیەوە، پێدەچوو ئەویش منی ناسیبێتەوە، دەستی ڕاوەشاند و هاواریکرد:

کوڕێ من، مەرد بە، به ئێزیدی بژی.

شەوە، له شوێنێکین، نازانم کوێیە، ئێمه شەش کەسین، گەورەکەیان ئاوزەی منه، نازانم موسڵمانن، ئێزیدینه، مەسیحینه، کوردن یان عارەبن، کەس قسه ناکات، هەموو تاساون.

گوێم لێیه چەند چەکدارێ لە نێوان خۆیان بە تورکمانی دەئاخفن، دواتر بووە عارەبی، بەڵام بە شێوە زارێ قسەیان دەکرد، باش تێنەدەگەیشتم.

بە خۆم نەوەستام، لەوەی تەنیشتمم پرسی:

+تو ئێزیدی؟

-لەو پرسیارە گەڕێ.

لێگەڕام و بە دوادا نەچووم، پاش کەمێ کەسێکیدی بە ئەسپایی، بە زمانی عارەبی گۆتی:

دەزانن ئێمەیان بۆچی هێشتۆتەوە؟

کەسێ وای وەڵامدایەوە:

+هێشتنەوەی چی؟ هەر بزانە تیربارانیان کردین.

-نا، پێناچێ بمانکوژن، دەیانەوێ بمانبەنە ریزی خۆیان و خەڵکمان پێبکوژن.

ئەمن قسەی ئەو کوڕەم، کەوتە دڵی، دوا رستەی داکیشمم بیرکەوتەوە، دوای ماوەیێ، چەکدارێ هاتە لامان، هێند بە نەرمی سڵاوی کرد، هێند بە سۆزەوە لە دۆخی پرسین:

ها، گەنجە قۆزەکان چۆنن؟ چیتان پێویستە؟ بڵێن

لە دەنگی ئەو چەکدارەوە سۆزێ هەبوو، باوەڕت بە چاو و گوێی خۆت نەدەکرد، دەتگوت، ئەو پیاوە پێناچێ نەك گوللەی بە کەسێکەوە نەنابێ، دارلاستیقیشی لە چۆلەکەیەك رانەکێشابێ، ئەو شتەی وا بە شانیشیەوە، تفەنك نیە و کەمانچەیە.

دوای کەمێ، خواردنیان هێنا، لە خواردنەکەی ماڵی کریڤ دەچوو، من دایکم و بابم بیرکەوتەوە و دەوم لێنەدا.

ئێستا لە بن دیوارێکین، نایناسمەوە، نازانم چ کۆڵان و گوندێکە، لە سەرە کۆڵانی ئەو سەری، هەندێ چەکدار سێ چوار ژنیان بە پێش خۆ داوە، ژنێکیان زارۆیەکی بە ئامێزەوە بوو، چەکدارێ لە گژە لە ئامێزی دەرێنێ، ژن توند بە خۆیەوە نووساندووە و نایداتێ.

چەکدارێکیدی گەیشتێ، لە ئامێزیان راپسکاند، وەی، وەی! ئەوەی من دیتم، خودایە، تەنها کریڤەکەی منی گەیاندە ئێرە، بیبینێ، نایەتە گێڕانەوە، زارۆ ناهێتە گێڕانەوە...

خودێدە دیسان هەوکی گیرا، ریز ریز رۆندکانی باراند، تاوێکی باش گریا، چاوی سڕی و فنی کرد:

ئەو بێ دینە، ئەو هۆڤە، دەستی منداڵەکە کە بە پەنجە ناسکەکانەیەوە دەتگوت گوڵنارن، گرت و لە ناو لەپە گەورەکەی بزربوو، بڵندی کرد و سووڕاندی، منداڵەکەی لە سەر سەری خۆی سووڕاند، وەك چۆن سەرچۆپیکێش لە شایی دەسماڵ بادەدا، ئەوهای بادا، زیڕەی زارۆ گەیشتە ئاسمانێ و نە خودا، نە کەس بەهانایەوە نەهات، نازانم چۆن پیلی لە بنەوە دەرنەدەهات، ژنەش وەك بڵێی تووشی گەشکە بووبێت، تەماشای منداڵەکەی دەکرد، چاوی لەگەڵ سووڕانەوەی وی دەسووڕایەوە، نازانم چەند جاری سووڕاندەوە، هێندەم دیت منداڵ فڕی، چاوەکان هەموو لە چاوەڕێی کەوتنەوەی منداڵن، هەر یەکەوە تەماشای شوێنێ دەکات، تا ببینێ منداڵە چۆن بەردەبێتەوە.

منداڵ نەهاتەوە زەوی، نەڵێن لە ترسا لە هۆشی خۆی نەماوە و هەر وا تێگەیشتووە کە منداڵەکە بە ئاسمانەوەیە، باوەڕتان بێ، بە چاوی خۆم دیتم منداڵەکە لە سەرەوەی دارتێلەکاندا،

دەفڕی، ڕێك لە شێوەی كۆتری گیراو، ئەو كۆترەی باڵی دێتەوە و بیری كۆنە لیسی خۆی دەكاتەوە، كۆترێك بەر لەوەی ڕێی ڕۆیشتنەوە ببینێتەوە، چەند جارێ لە ئاسمانێ بازنەیی دەخولێتەوە، لە پڕ خەتێ دەگرێ، تیژ ئاسمان دەبڕێ، منداڵ ئاوای كرد و دوای چەند سووڕانەوەیەك، لە ئاسمانەوە ڕێی گرت، بووە كۆترە شینكە و ڕێی ئێرە، ڕێی شنگالی گرت، چەكدارەكان چەند فیشەكێشیان پێوەنا.

لە فڕینی منداڵ هەموو واقوڕماو بوون، لەو ساتە هەلێكی باش بوو بۆ خۆ دزینەوە، بۆ هەڵاتن، هەڵاتم، بە ڕێی زارۆی باڵگرتوودا هاتم، ئەو بەرێی ئاسماندا و من بە ڕێی زەویدا، ئەگەر ڕێم هەڵەكردبا، سەرم هەڵدەبڕی، زارۆ فڕیوەكەم دەدی و دەهاتمەوە سەر ڕاستە ڕێ، زارۆی ئاسمان، زارۆی بە كۆتر بوو، نەبا، من ڕێی چل مێرام نەدەدیتەوە..

خودێدە، تەواوێ لە گوڵەشلێرە راما، لە بەر خۆیەوە:

من دەڵێم، ئەوە منداڵە فڕیوەكەیە، وەی خوایە، چەند بەو دەچێ، هەوە.

خودێده غاری دایه گوڵەشلێره و به خۆیەوه گوشی، بەڵام سەیر بوو، ئەو جاره منداڵه خۆی رانەپسکاند، تەواوی له باوەشی مایەوه.

خودێده چەند تیکه نانێکی به نا بەدڵی خوارد، چۆوه شوێنەکەی خۆی و له سەر چاو کەوت.

دیرۆکزان، رادیۆکەی له بن گوێیه، ناوه ناوه کەمێ دەنگی بەرزدەکاتەوه:

((سەدان ئێزیدی به چیای شنگال کەوتوون، داعش دەوری داون، رێی هیمدادی لێگرتوون، هەموو خەریکه له تینووان و برسێتیدا گیان دەسپێرن، ئەو ئاو و خۆراکەی له رێی فرۆکەشەوه بۆیان بەردەدەنەوه، کەس نازانێ له کوێ دەکەوێ، نابینرێنەوه..))

کوڕەی روو به ماچ:

وا چاکه ئەو بەچیا کەوتووانه ببینینەوه و تێکەڵیان بینەوه.

دیرۆکزان:

بیرێکی لێدەکەینەوە، با رۆژ بێتەوە، پێدەچێ لێرەوە زۆر دووربن، ئێمە زۆر هەڵکشاوین، گەیشتووینەتە نزیك ئاسمان.

## خرِ ڕێییەکان دەچنەوە

## چل مێرا

تیشک و کەژێ پێکڤە گەیشتنە سەر تاشەبەردەکانی بەری ڕۆژی چل مێرا، چ ڕۆژێ بە وێنەی ئەوڕۆ، بلەز نەبوو، لە خوێندنەوەی تیشک و بەرد، لەو منداڵە زیرەکەی ناوپۆلێ دەچوو، کە مامۆستا لە سەر تەختەرەشێ، دەینووسی و ئەویش یەکسەر دەیخوێندەوە و دەست و تەباشیری مامۆستا بە چاوی وی ڕانەدەگەیشت، کەژێ وابوو، پێش تیشک دەکەوت، پێش زاری پیری چل چلە دەکەوت:

هێشتا عارەب دەچلە و فڕەهاتیان نەدیتبوو، هێشتا ترك لە چ جێیان دیار نەبوون، عەجەم نەیاندەزانی ئارارات لە کی لایە، ئێزیدی لە شنگالێ بوون، لە لالشێ بوون، لە هەموو کوردستان و نێوان دوو زێدا بوون.

کەژێ دەنگی نزمکردەوە، هەندێ رستەی گۆتەوە کەس نەیبیست، دوای کەمێ دەنگی بەرزکردەوە:

چ جلکێ لە جوانی ناگاتە جلکی ژنە ئێزیدی، ناگاتە جلکی پیاوی ئێزیدی، لە دنیایێ جلکی لە شێوەی هی ئێزیدیان نەبووە و نابێتەوە، هاتن، نەوە نەدیتکەکانی بابێ سۆفیانی هاتن و لە جلکی ئێزیدییان بڕی و دزی و بردیانە ولاتی شامێ، هاتن چەتەکانی ئۆسمانی هاتن و لە جلکوبەرگی ئێزیدیان دزی و بڕی و بردیانە ئەستەنبۆلێ، بردیانە هەموو جێیان، ئێستا لە هەر کونجێکی ئەو ولاتانە بگەڕێی، نەخشێ، ملیوانێ، سەردەستێ، شێوەی دەلینگێ، چنینی گولێنگێ، شتێ لە جلکی ئێزیدیان دەبینیەوە، جلکوبەرگی هەموو کورد، بە هی ژن و پیاوەوە، بە هی منداڵەوە، جلکوبەرگی ئێزیدییانە.

دوایوەی هەموو نەیناوا، دەڤەری ئێزیدیان، شاری شنگال و هەر چوار ئالی چیای شنگالی، عارەب گوڕیکردی، زۆر جێ تەواو بەعارەبکرا، لە هەندێ زێدی ئێزیدی، ئێزیدی نەمان، یان بوونە کەمینە، جلکی عارەبی داکەوت، هەندەك پیاوی ئێزیدی پۆشیان، دەزانن بۆ؟!

کەژی هێندە بەزر پرسارەکەی خوێندەوە، وەك ئەوەی پرسیار لە دەور و بەرەکەی بکات، دیرۆکزان دەنگیهەلێنا:

بەلێ...

لێ کەژێ، نە بەلێی بیست و نە هیچ، درێژەی بە خوێندنەوەی خۆی دا:

لە دوای هەلاتن و ئاوابوونی ئۆسمانی و هاتن و هەلهاتنی دەولەتی عارەبی لە عێراقێ، عارەبی نەیناوا، عارەبایەتیی ئایینیی گەلەك هەستا، بە ئاشکرا و لە بەر چاوان، لە پێش دەرگای نەبی یوونس تیزیان بە ئێزیدی دەکرد، پژدێنیان دەکردنەوە، دۆخینیان رادەکێشان، کلاویان لە سەریان دەڕفاند و

بۆ یەکتریان هەڵدەدا، وەلەکە عارەب لە سەرە کۆلانانەوە هاواریان دەکرد:

ئێزیدی گاور، شەیتان پەرست.

پۆلیس پێیانپێدەکەنین، ئێزیدی ژانیان لێبووە ژار، ژاری مار نا، هی عارەب، گەیشتە پەلاماردان و تێهەڵدان، وای لێهات، ئێزیدی نەوێرێ بە تەنێ، یەك و دوو بچنە بازێرێ، بۆ خۆ دەربازکرن لە سووکایەتی نەوەکانی عومەر و بابێ سۆفیان، هەندەك ئێزیدی هاتن، لە چوونە بازێرێ جلکی عارەبیان لەبەردەکرد، بەوە لە ناو عارەبان تێبزردەبوو، عارەب بە عارەبیان دانان، ئیدی سالێ هات و چوو، هندەك پیاوی ئێزیدی خووی بە کراسی درێژ و دیش و چەفیەوە عەگالەوە گرت، فەرمانەکەی مەلیك غازیش، تیرتری کرد، ئەوەی خوێنی ئێزیدیانی مینا خواردنەوەی ئاوی دەچلە، وێنەی هەنجیر و هەنگوینێ چیای شنگالێ، وەکو گەنم و جۆی قەراجێ، چەشنی بابەگورگوری کەرکووکێ، بەپێی ئایەت و فەرموودان بۆ عارەبی موسڵمانی حەلاڵ کرد، سەدام حوسێنیش، ئەوەی لەگەڵ

ئێزیدیان دژایەتی ئایین نا، هی نەتەوایەتی هەبوو، پانەوپان نەو ناوەی عارەباند.

هەندەك ئێزیدی لەگەڵ جلکی عارەبی راهاتن، چ شتەکیش وەك جلکوبەرگ نیە، مرۆڤ گەلەك زوو لەگەڵی رادیێ.

ئێزیدیش جلکێ خۆ دەکاتە گۆرییێ دینێ خۆ، دەکاتە بەلاگێڕی زمانێ خۆ، دینێ ئێزیدی دینێ خودێیە، زمانی ئێزیدی زمانی بەهەشتێیە.

کەژێ بە دەم گۆتنەوەی (ئێزیدی دینێ خودێیە) بەرەو کانی غاری دا، دەستی راستی بە چەقۆوە لە سەر سەری دەتگوت داری ئالاّیە، دەڕۆیی و ئیزیدی دینێ (خۆدێیە)ی دەگوتەوە وەك بلّێی پێش خۆپێشاندەران کەوتبێ، ئەوانیدیش جگە لە خودێدە بە دوایەوە بوون، سە سپیش لە تەنیشتی دەڕۆیشت، ناوە ناوە سەری هەڵدەبڕی و تەماشای دەست وچەقۆی دەکرد، هەشتسمێڵ گوڵەشلێرەی لە باوەشە و لە دواوەیە، وەك هەموو جارێکیش لقە چروویەکی گەلاّپری بە بەر پژدێنەوەیەوە، سێبەری لێکردووە، ناهێڵێ ئەو گوڵە ناسکە تاوە سووت بێ.

لە دەو کانی تەواوێ دانیشتن، ئاویان خواردەوە، دەست و چاویان شووشت و دەبە و دێمکە و مەتارەیان پڕکردەوە، کەژێ یەك یەك سەیری هەموانی دەکرد، دەیوست شتێ بڵێ، دەیگێڕایەوە، هەشتسمێڵ پێدەچوو لە مەبەستی تێگەیشتبێ بە ئاماژە، بە بزەوە هەیهایەکی لێکردن و هەموو هەستان و چوون.

کەژێ و گوڵەشلێرە مانەوە، دوای چۆلبوون، لە گۆماوەکەی خوار کانیەکە خۆیانی پشیلە شۆر کرد، خێرا خۆی و گوڵەشلێرەی لەبەرکردەوە، نەیهێشتبوو، چەقۆکەی پشکە ئاوێکی وێ بکەوی.

سەرکەوتەوە، گەیشتەوە، بن دەرختی خوێندنەوە، چاوی بە تیشکی سەر تاشەبەردان گێڕا، زۆری گێڕا، چ خەتی نەدیتەوە، سەری بادا و بە نابەدڵیەوە رێی ماڵێی گرتەبەر، سە سپی لە بن گابەردی ماڵ چاوەڕێی دەکرد، بە ئاماژەی کلك، پێیگۆت:

با بچینە ماڵی گەورە، ئەشکەفتەکە.

کەژێ بزەیەکی هێند شیرنی بۆ کرد، کەس بزەی وای بە لێوی کەژێوە نەدیوە، مەگەر سالحۆ، ئەگەر دیرۆکزان و یارانی

ئەشکەفت دیتبایان، مزگێنی بەرایی سەردەمێکی تازەیان لێی دەخوێندەوە، سە سپیش هەستی بەو بزەیە کرد، حەپەیەکی شیرنی بۆ کرد، ئەگەر کەسێ هەبا، زمانی سەگ بۆ زمانی ئادەمیزادان، بۆ زمانی ئێزیدی وەرگێڕابا، ئەو حەپەیە دەبووە: گیانی من.

کەژێ بە قسەی کرد و بە دوایدا چوو، دیسان لە زارکی ئەشکەفتێ، سە سپی راوەستا و کەژێ و گوڵەشلێرەی پێش خۆی دا، گوڵەشلێرە، یەك دوو گەڕ، بە دەوری کەژێدا سووڕایەوە:

دادە، دادە...

خۆی هەڵدایە باوەشی و ماچێکی قووڵ و بە ئاوازەی لە سەر کولمی کەژێ کرد.

لە ئەشکەفتەوە، رادیۆ قسە دەکات و دیرۆکزان دەستی لە سەر دوگمەیە و دەیسووڕێنێ، لەوێوە بۆ ئەوێ:

خەونی گەورەی داعش هەولێر بوو، هێندەی نەمابوو بێتەدی، تا بنیشی هات، شکا و خەونەکەی بردە ناو گۆڕێ...

دیرۆکزان:

هەر شنگال نا، کوردستان هەمی لە نەخشەی داعشدایە.

کوڕی روو بە ماچ:

بەڵام بگاتە هەر شوێنێ، وەکو شنگال و ئێزیدیان بەسەر ناهێنێ.

کریڤ گۆت:

تۆ راست دبێژی.

کوڕی روو بە ماچ:

لە پێش چاویان دەچنە گژ داك و خوشکیان؟!

دیرۆکزان رادیۆی کوژاندەوە، کوڕی روو بە ماچ هەستا، پشت لە ئەشکەفتێ روو لە دۆڵێ هاوارێکی لێبەرزبۆوە، لە کەسێ دەچوو، سێ شیشی سۆرکراوەیان لە سەر لەشی راگرتبێ، هەشتسمێل، هەستیکرد کوڕە هاواردەکات، زوو گوڵەشلێرەی خستە باوەشی و سەری خستە نێوان هەردوو لەپی و توند گوێییەکانی گرت، سە سپی کەوتە هەڵات هەڵات لەو سەری ئەشکەفتەوە بۆ ئەو سەر.

هاوارەکەی زۆر درێژکردەوە، دولاودۆڵ رۆیی، رووی بەرەو ناو ئەشکەفت وەرگێڕا:

دەزانن چیان لە من کرد؟

کەس نەیگۆت:

چی

بە گریانەوە هاتە گۆ:

لە دورِ ماڵی بە سەریاندادایین، منیان قۆڵبەستکرد، یەکیان پڕیدایە خوشکم و یەخەی کراسەکەی دادڕی، من جوونم داو تفم لێکردن، خۆزگە وام نەدەکرد، بەر شەقیان دام بە پە نجەرەکەوە بەستمیانەوە، دیتم دایکم و خوشکمیان رووتکردەوە، بە بەر چاومەوە، دوو کەس چوونە گژیان، ئەوان هەستان، دوو کەسیتر بە (لا ئیلاهە ئیلە لا محەمەد رەسوولە لا)وە چوونە سەریان، ئەمن چاوم دەجووقاند و جوونم دەدا، داك و خوشکم هاواریان دەگەیشتە ئاسمانێ، وازیان نەهێنا، دوو دوو بە الله و محەمەدەوە دەهاتن و هەردەستان، وا بزانم حەفت جووتم لەو هۆڤیانە ژمارد...

ئەمن لە خۆ چووم، نازانم نە بە لێدان نە لەحەژمەتا لە خۆ چووم، کاتێك بە ئاگاهاتمەوە لێرە بووم، لەو رێیە هەندێ شتم لە شێوەی خەون، خەونی منداڵی وەبیردێتۆ:

کەسێ دەستمی دەکردەوە و دەیگۆ:

دەی براکەم، هەستەوە، زوو خۆ بگەیەنە چیا.

دەنگ لە دەنگی ئۆفای خوشکم دەچوو، ئۆفای سوخمە دڕاو...

لە بن تەلانێکم، ماریش نەکارێ پێیدا هەڵگەڕێ، لە پڕ لە تەنیشتمەوە جووتێ پێڵاوی سپی سپی، لەو سە سپیش سپیتر، لە جێی خۆیان دەجوولانەوە، ناسیمنەوە، پێڵاوی دایکم بوون، پێلاوەکان رێچکەیەکیان گرت، بە دوایاندا چووم، پێڵاوی بێ پێ، بێ دایکم، وەك ئەوەی بە سەر پێوە بن، شەقاویان دەهاویشت، پێ بە پێ، بە شوێن پێڵاودا هەڵگژام و هاتم.

لەپڕ لە خەونی پێڵاو بە ئاگاهاتم و خۆم لێرە لەو چل مێرایە دیتەوە.

کوڕی روو بە ماچ، لە هاڕژنی گریانی دا، لە بن فرمێسکان دەیگۆت:

ئێوە پێلاوەکانی دایکمتان نەدیوە؟

هەموو گریان، سە سپی و گوڵەشلێرەش، کەژێش چەند تنۆکە رۆندکێکی داباراند.

کوری روو بە ماچ، لە زارکی ئەشکەفتەوە، روو لە ئاسمان :

خودایە، دەستی خوشکمم بۆ بنێرەوە، من دەستبەستەم، هیچ نەبێ پێلاوەکانی دایکمم بۆ بگەڕێنەوە، من چ رێ پێنازانم...

دیرۆکزان چوو، دەستی لە ملی کرد و گوتی:

هەموو رێیەکانی ئێزیدی دێنەوە شنگالێ، دێنەوە چل مێرا، ئێمە لێرەین، پارێزراوین و نەترسە.

رادیۆ لە دەستی کریڤۆیە، بە کوردی دەڵێ:

لە چیای شنگالێ، هەندێ ئێزیدی، لە رێی ئاسمانەوە، بە هۆی باڵەفڕەوە، دەربازیان بوو.

دوای هەواڵەکە، یەکسەر، سروودی:

پێشمەرگەی بە هەڵمەتین...

ئەشکەفتی پڕکرد، کوڕی روو بە ماچ، جرتێکی لێکێشا، دیرۆکزانیش بە ئاهـ هەڵکێشانەوە:

پێشمەرگەی بە هەڵمەت، لەگەڵ مەحموود ئێزیدی چوو.

رادیۆ ئێستا لە بنی ئەشکەفتێ، لە سەر ریزە بەردێ، کە دەڵێی تاقن و بە دەستی ئێزیدی چێکراون، بە عارەبی بۆ یارانی ئەشکەفت قسان دەکات:

چەکدارانی کورد، لە بەری رۆژاوای چیای شنگالەوە دڕیان بە داعش دا و رێی دەربازبوونیان بۆ بە بەچیاکەوتووان کردەوە...

کوڕی روو بە ماچ:

دەریایەك ئێزیدیان چککرد، گۆلێ دەرباز دەکەن؟!

هەشتسمێلیش لە رەنگو رووی ئەوانەوە، خوێندیەوە کە هەواڵێکی خۆش بەرێوەیە.

## چل

## چلەی زستانێ، چلەی هاوینێ

## بۆ زەوی

دیرۆکزان و کوڕی روو بە ماچ، بۆ پێکەوتن بە راستودرووستی رێکردنەوەی بەری رۆژاوا، لە ئەشکەفتێ دەرچوون، سە سپی زۆر حەزی دەکرد، بەگەڵیان بکەوێ، بە زۆر گێڕایانەوە و نەیانبرد.

هەشتسمێڵ، وازی لە کەزی زەر، نەدەهێنا، وەکو رۆژان نەبوو، بە یەك دوو جار قۆڵ گرتن وازی لێبێنێ، کەژێ چەندی

خۆی لە دەستی رادەپسکاند، ئەو قۆڵی دەگرتەوە و بە ئاماژە پێیدەگۆت:

بوەستە، شتێ هەیە، دەبێ پێتبڵێم.

کەژێ بێزار بوو، ملی دا، بە دیاریەوە دانیشت، تەماشای ناو چاوی یەکتریان دەکرد، کەژێ هەستیکرد پێشترێ ئەو پیاوەی دیتووە، بیریکەوتەوە جارێ دوو، لە دوورەوە لەگەڵ پیری چل چلە بینیویەتی، بەوە خۆشیەك نیشتە سەر رووی، هێ لە هەندی، بە هەندێ ئاماژەی دەست و چاوی وی، تێگەیی ئەویش دەیناسێ و دەزانێ کچی پیری چل چلەیە، بەوە پتر گەشایەوە، هەشتسمێڵ بە جوولەی دە پەنجە و لێو و چاو، جاروباریش هەستان و دانیشتنەوە، وێنەی پیاوێکی لە چاوی کەژێ، کێشا، رێك چل چلە بوو، کەژێ لە خۆشیا هێندەی نەمابوو، هاواربکات، بە ئاماژە پێیگوت:

ئێ، بلێ...

هەشتسمێڵ بە دەم جغارەکێشانەوە، چەند جغارەخۆرێ، باسی پیری چل چلەی کرد، کەژێ هێندە تێگەیشت کە زۆر

برادەر بوونە و ئەو رۆژەی داعشیش شنگالی ئەنفال کرد، لە سەر جادە بینیویەتی.

ئەوەشی تێگەیاند کە چەند رۆژە بە گومان بووە،بەڵام ئەورۆ بۆی روونبۆتەوە کە کچی پیری چل چلەی.

کەژێ دەیوست، زوو پێبکەوێ داخوا شتێ لە بارەیەوە دەزانێ، لێ هەشتسمێڵ پەلەی نەبوو، پتر لە مەڕ خواپەرستی و لێزانی چل چلەوە دەپەیڤی:

چوار جار هەردوو دەستی بەرزدەکردەوە و هەر دە پەنجەی دەکردەوە و ئەوجا بە دوو پەنجە لێوی خۆی دەدووری و توند دایدەخست، کەژێ تێدەگەیشت مەبەستی ئەوەیە کە چل رۆژ بە رۆژوو دەبوو.

دیسان بە نمایشکردنی چل پەنجەکەوە، لە رێی ئارەقە سڕین و خۆ باوەشێنکردنەوە هاوینی دەهێنا، کەژێ و ئەوانیدیش تێدەگەیشتن، چل رۆژ رۆژوو گرتنەکە دەکەوێتە چلەی هاوێنێ، ئەوجارە، لە رێی خۆ کورژکردنەوە و فوو لە دەست کردن و ئەوانەوە، زستانی دەهێنایە ناو ئەشکەفتەکە، لەوەش

تێگەیشتن، پیری چل چلە لە چلە زستانیێش چل رۆژ بە رۆژوو دەبێ، ئەو چل رۆژووی چلەی هاوینێ و چل رۆژووی چلەی زستانێ...

هەستا و دانیشتەوە، پەنجەکانی دەست و پێی نیشان دان و لە پەنجە خستنە سەر هەر پەنجەیەکی، دەهات سەری پەنجەی تا ئاستی سەری خۆی بەرزدەکردەوە، لەوێ بە هێواشی لە هێلێکی بازنەیی دەیخولاندەوە، بیست جار خولاندیەوە، خودێدە کە زۆر نەبوو، لە خەو هەستابوو، گۆتی:

تەواو، بیست ساڵ تەواو...

کەژێ تێگەیشت، پیری چل چلە، بیست ساڵ و هەر ساڵی چل رۆژ لە زستان و چل رۆژ لە هاوین بە رۆژوو بووە.

کەژێ ئاگایلێبوو پیری چل چلە ئەو رۆژووانەی دەگرت، ناوەکەش هەر لەوەوە بە سەریدا بڕا، بەڵام نەیزانبوو، چل چلەکەی تەواوکردووە، قسەیەکی وی بیرکەوتەوە کە زۆر جار دەیگوتەوە:

کچم، ئۆلدارانی ئۆلەکانیدی بۆ چوونە بەهەشتیٚ بە رۆژوو دەبن، بەڵام رۆژووی چلەی هاوینیٚ ئێزیدی بۆ ئەوەیە تا خودا زەوی بپارێزیٚ لە گەرما و هەڵقرچان، رۆژووی چلەی زستانێشی بۆ پاراستنی زەوی لە لافا و سەرماو و سۆڵە.

کەژیٚ بە چاو و پەنجە، بە هەشتسمێل دەڵیٚ:

شتیٚ بڵیٚ، چ سۆراخێکی چل چلەی مامم دەزانی؟

بەڵام ئەو پەلەی نیە، دوور نیە نەیەویٚ هیچیدی بڵیٚ، کەژیٚ پیلی دەگریٚ -کەس شتی وای لێنەدیتبوو- پیلی دەگریٚ و رایدەوەشێنیٚ، هەشتسمێل، بە ئاماژەی دەست داوای لێدەکات هێوربێتەوە، بە ئاماژەی سەر پێیدەڵیٚ:

باشە...

هەشتسمێل هەڵدەستێتە سەرپیٚ و قۆڵی کەژیٚ دەگریٚ، روو دەکاتە سەری دوندەکان، سەری پەنجەی بۆ هەندێکیان درێژ دەکات، بە هەر شێوەیەك دەبیٚ کەژیٚ تێدەگات کە پیری چل چلە لە سەر ئەو لووتکانەیە و بۆتە ئێشککێشی شنگالیٚ.

هەناسەیەکی سارد هەڵدەکیشێ و لێی دوور دەکەوێتەوە، دەچێتە لای سە سپی و گوڵەشلێرە، هەشتسمێڵ چەندی بە دەوریدا دەسوورێتەوە و دەیەوێ هەندێ شتیتری بۆ باسبکات، ئاوڕی لێناداتەوە و لە تەماشاکردنی چەقۆوە دەگاتەوە دنیای خۆی، دنیای ئاخاوتن لەگەڵ نادیاری و نادیاران، گرتە گرتە گرتەکانی ژیانی دەهاتەوە بەرچاو، چوونە سەر گۆڕی دایکی، لە سەر گۆڕی ویەوە رووی لە خودا کرد:

ئێ هیچ نەبا گۆڕێکی ئاواشت بە بابم دەبەخشی.

لەوێوە دەگەڕایەوە باوەشی مامەی چل چلەی بە سۆزی وی و چیرۆکەکانی، سێویی خۆی لەبیردەچۆوە، هەردەستا و دەستی سالحۆی دەگرت و دەچوونە سەر دەچلە، لەوێوە بۆ پردی دەلال، لە سەر پردەکەوە لە شەقەی باڵیان دەدا و لە سەر کانیا سپیی لالشی پیرۆز دەنیشتنەوە.

کەژێ لە دوای گەڕان بە ژیاندا دەگەیشتەوە دوا گرتە و دوا گۆتەی پیری چل چلە:

کچم، تۆ دەبێ بە چیا کەوی.

بە نیازی چیا پیێ هەڵدێنیێ، لە سەرە کۆڵانیێ قۆڵی دەکەوێتە
ناو دەستی مەرگەوە، مەرگ دەیباتە ناو چاوە خانوویەك،
هێندەی لە بیرە، زەلامێکی کەتە لە سەری هەڵدەستیێ،
زەلامێکی دی دێتە سەری، لەو ساتە چەقۆکەی بیردەکەوێتەوە،
ئەو چەقۆیەی پیری چل چلە خستیە بەرکیەوە و گوتی:
کچم، بە کەلکت دیێ.
دێتەوە بیری لە بن پیاوەکەوە، هەرچۆنیێ بوو، دەستی
گەیاندە چەقۆکەی و وەشاندی، دیاربوو جێیەکی باشی گرتبوو،
زەلام لە مشەمش کەوت و بە تەنیشتا کەوت.
چەندی بیردەکاتەوە، بیریناکەوێتەوە، چۆن لە ژوورە
خوێناویەکە، لە ناو خوێنی دامەنی خۆی و خوێنی کەلەکەی
چەتەکە، دەرپەڕی و نەکەوتەوە دەستیان.
لە تووڕەگە بە شاندا دان و لە شار دوورکەوتنەوە، بە چیادا
هەڵگەڕانی دێتەوە بەر چاو، ڕێنیشاندان و نیشانەکانی پیری چل
چلەی بیردەکەونەوە:

بە ڕێیە بەردەڵانەکەدا سەر دەکەویت، دەگەیتە دووڕیانێ، دەستی چەپ بگرە، تەواوێ دەڕۆی، بنەدارێکی گەورە دێتە ڕێت، لەو ڕەت دەبی ڕێ نامێنێ، چەند ڕێچکەیەکی لێدەبێتەوە، تۆ ئەوەیان بگرە کە بە چەپی بەردێکدا دەڕوا، دەڵێی سەگێکی ڕەشە و هەڵتووتکاوە، زۆر دەڕۆی هەورازێکی سەختت دێتە ڕێ، ئەگەر نەتتوانی قەدبڕ بیبڕی، پیچاوپێچ سەرکەوە، بەڵام وریابە لە و شوێنەی لێی دەدەیت، لە هەمان ڕاست بگەوە سەر چیاکە، ئەودیوی هەزار بە هەزارە، بەڵام ڕێك لە ڕاستی خۆت لێژە بەوە، ڕێ هەیە، لەو سەرەوە لووتکەیەك دیارە، لە گومبەزی سەر شەرەفەدین دەچێ، ڕێك بە ناوەندی لێڕەوارەکەوە بۆی سەرکەوە، ڕێیەکی پێچاوپێچ دەتباتە سەر شانی، لەو ئاو دیو بە، چل مێرا بە خۆی بانگت دەکات.

کەژێ لە ناو شارەوە تا سەری چل مێرا، ناوە ناوە چەقۆکەی دەستی دێتەوە بەر چاو، بە نیشاندانەوەی چەقۆ هاتەوە ناو ئەشکەفتەکە و تەماشای چەقۆکەی کردەوە، لە بەر خۆوە:

ئەویتریشم کوشتبا!

یەکپێ هەستا، گەیشتەوە ماڵە هەنجیریەکەی خۆی، توورەگەی کردەوە، دەفتەرەکەی دەرهێنا، نووسی، لاپەڕەیەکی پڕکردەوە، لە لاپەڕەی دووەمیش چەند دێڕێکی نووسی و دایخستەوە.

لە ماڵەکەی هاتە خوارێ و گەیشتەوە دیار تاشەبەردان، چاوی گێڕا، هیچی نەدیتەوە، سەری هەڵبڕی، ڕۆژ لە سەر ئاوابوونە، بە نائومێدی گەڕایەوە، سە سپی لە ملەکە چاوەڕێی دەکرد، بە تەنیشت یەکەوە ڕۆیشتن، بەر لەوەی پێچ بکاتەوە بۆ ئەشکەفتەکە گەڕایەوە، سە سپی پێشی پێگرت، خۆی لێ لادەدا دەهاتەوە سەر ڕێی، سەگەکە لەو لاملتر بوو، ناچار بە ئاماژە پێیگوت:

دەچم شتەکانم دێنم، دەگەڕێمەوە.

سە سپی لە زمانی تێگەیشت و ڕێی بۆ کردەوە، چوو توورەگە و کەرتە نیمدەرەکەی هێنا و هاتەوە، سە سپی لمووزی بۆ توورەگەکەی دەبرد و حەو حەوێکی دەکرد، کەژێ تێگەیشت

دەیەوێ بۆی هەڵگرێ، بەلام نەیدایێ، سە سپیش زۆری لێنەکرد.

هەشتسمێل بە دیتنی کەژێ، وەك گوڵێلکە نیسانە گەشایەوە، ئەوەی لە چارشەما سۆر، بۆ لالش پێدەکەنێ، منداڵەکە، لە وێنەی بەرخۆلە بە خۆ بادانەوە خۆی هاوێشتە ئامێزی.

کوڕە کۆچۆیی:

باش بوو، هاتی، تۆش لێرە نەبای، دڵمان دەتەقی، ئەوان نەگەڕانەوە، شتێکیان بە سەر نەهاتبێ؟!

کریڤۆ:

نەخشەی خراپ لێمەدە، ڕێیان دوورە، سبەش ناگەنەوە ئێرە.

دوای نان خواردنێ، کەژێ لە تەنیشت گوڵەشلێرە ڕاکشا، توورەگەی خستە بن سەری خۆی و چەقۆکەی لە بن دانا و باسکیشی بۆ گوڵەشلێرە کردە سەرین، لە بن لێوانەوە:

دایکیشم منی وا خەواندووە.

گوڵەشلێرە لە خۆشیا خەوی لێنەدەکەوت، سە سپیش هات لە تەنیشتەکەیتری وەرکەوت.

کریڤۆ، رادیۆکەی خستۆتە بن گوێی، زۆر کزی کردووە، هەر خۆی دەیبیستێ.

خودێدە زوو خەو بۆ خۆی بردەوە.

هەشتسمێل، تەنیشتان دەگۆڕێ و خەو لە چاوی تۆراوە.

ئەو شەوە، لە چاوەڕێی دیرۆکزان و کوڕی روو بە ماچ چوونە تاریکایی ئەشکەفتەوە.

## گوڵەشلێرە

## گوێیەکانی پڕ قسەن

کریڤۆ لە شیرنەی خەوێ، هەستیکرد دەستێ بە نەرمی شانی رادەتەکێنێ، تێگەیشت دەستی هەشتسمێڵە و گازیدەکات بۆ نوێژکردنێ، لەوەتەی زانیویەتی موسڵمانە، نوێژیان بە ئاگایدەهێنێتەوە و نایەلێ نوێژی بچێ.

هەستا و لە ئەشکەفتێ چووە دەرێ، سە سپیش بە دوایەوە، بۆ ئەو نوێژەش چۆوە سەر تاتەبەردەکەی خۆی، کەوتبووە دەستی چەپی ئەو پێچەی کە بۆ تاشەبەردە کتێبیەکان پێچیدەکردەوە،

له بن دره‌ختێكی پڕ پرژ، روو له رووگه، ده‌تگوت خودا به ده‌ستی خۆی بۆ نوێژ له‌وێی راخستووه، كریڤ نوێژی دابه‌ست، سه سپیش وه‌ك پیشه‌ی خۆی، له لای چه‌پی وه‌ركه‌وت، له هه‌موو نوێژیێ، تا سلاوی چه‌پی نه‌دابایه‌ته‌وه، سه سپی له جێی خۆی نه‌ده‌جوولا، به‌لام ئه‌و به‌یانیه وا نه‌بوو، له نیوه‌ی نوێژیێ، سه سپی، سێ چار حه‌و حه‌وی نه‌رمی كرد، ئاوڕێكی له كریڤ دایه‌وه، وێنه‌ی په‌لیك به ئاراسته‌ی كانیه‌كه‌دا ده‌رپه‌ڕی، موچركێ گیانی كریڤی داگرت وه‌ك گوێزان دلی بڕی، لێ خۆی گرت و نوێژه‌كه‌ی نه‌بڕی، په‌له‌ی كرد و خێرا خوێندی و سلاوی دایه‌وه و به‌ره‌و كانی بالی گرت و به فڕین فڕی.

دنیا ته‌واو رووناكبۆته‌وه، ده‌بینێ سه سپی كه‌مێ دوور له‌كانی له سه‌ر به‌ردێ هه‌لتووتكاوه، به دیتنی كریڤۆ، كلكی راوه‌شاند، تێگه‌یشت كه‌سێ لێره‌یه، ده‌بینێ، كه‌زی زه‌ر له سه‌ر به‌ردێ بێ هه‌ست و خوست دانیشتووه، خۆی رووتكردۆته‌وه، پرچی كردۆته‌وه و به خۆیدا داوه.

رووی خۆی وەرگێڕا و کەمێ کشایەوە، پاش کەمێ ئاوڕی لێدایەوە، هەمان دیمەنی بێ هیچ گۆڕانکاریەك دیتەوە، دیسان رووی خۆی وەرگێڕا، گازیکرد:

کەزی درێژ، خوشکی خۆم، هەستە بچینەوە ئەشکەفتێ.

وەڵام لە بەردەوە هات، لە کچەوە نەهات، ویستی بچێتە لای، شەرمی کرد و گەڕایەوە، دوای چەند جارێ ئاوەڕدانەوە و روو وەرگێڕان، چوو لە تەنیشت سە سپی پشت لە کانی دانیشت، چاوەڕێ ما، لەپڕ سە سپی، حەپەیەکی کرد و رێی گەڕانەوەی گرت، کریڤ، ئاوڕی دایەوە، کچە لەوێ نەماوە، تەماشای پێش سە سپی کرد دیار نیە:

چ خێرا، بە کوێدا رۆیشت؟

چاوی بە دەور و بەری کانیدا گێڕا، دیار نیە، کەوتە دوای سە سپی، سەگ خێرای کرد، نەیگەیشتێ، لە زارکی ئەشکەفتێ، گرتی، تەماشا دەکات، کەزی زەر بە جلکی خۆیەوە دانیشتووە، چاوی لە ساپیتەی ئەشکەفتێ بڕیوە، کریڤۆ، دوو

سیٚ زللەی لە روومەتی خۆی دا، قونجڕکەیەکی خێواندە لا رانی خۆی تا پێبکەویٚ، لە ناو خەونێیە یان نا، خەون نەبوو.

دیتی هەشتسمێل خودێدەشی بە ئاگاهێنا، زانی تاو کەوتووە و کاتی نوێژی وان هاتووە، سە سپی لەگەڵ ئەویش چوو، ئەو سەگە هەر کەسیٚ لە ئەشکەفتیٚ بچێتە دەریٚ بەگەڵی دەکەویٚ، وەك بڵێی پاراستنی ئەشکەفتنشینان بەو سپێردراوە و لە سەریەتی بیانپارێزیٚ، هەر کەسیٚ بچێتە نوێژیٚ، چ موسڵمان چ ئێزیدی، تا لە نوێژ دەبێتەوە، بە دیاریەوە وەردەکەوێت و ئێشککێشی بۆ دەکات.

کریڤۆ دەیویست، ئەوەی بەو سبیەنێیە لە کەزی زەری دی، بۆ هەشتسمێلی بگێڕێتەوە، چەندی هەوڵی دا، سەد جۆری ئاماژەی گۆڕی، تێنەگەیی و تێنەگەیی، یان نەیویست تێبگات، بێزار بوو، وازی لە سەربردەی کچی رووتی بن کەزیی دەو کانی هێنا.

ناوه ناوه تیچاوێکی دەدایە کەزی زەر، ئێ بەڵکوو شتێ لە سیمای بخوێنێتەوە، هیچ، هەر وەکوو رۆژانە و ئەو بەرە بەیانەی پێوە دیار نیە.

کریڤۆ چووە گژ رادیۆ، تا هێزی تێدابوو، چەپەرۆکێکی لە سەری خۆی دا:

پاتری مرد، لە دنیا دابڕاین.

بیریکردەوە، شەو نەیکوژاندبۆوە، نەفرەتێکی بۆ خۆی نارد، پاتریەکانی دەرهێنا، هەندێ قۆپاندنیەوە، خستنیەوە سەری، نیە، پاتری مرد و زیندوو نابێتەوە.

هەموو، جگە لە کەژێ، بە سە سپی و گوڵەشلێرەشەوە، بە دیار رادیۆی مردووەوە دەستەوئەژنۆ دانیشتوون، کوڕە کۆچۆیی دەڵێ:

با بمرێ، جگە لە مەرگی ئێزیدی چی پێبوو!

خودێدە:

ئاوەدانی بوو.

کۆچۆیی تیچاوێکی دایێ و بزەیەکی بۆ کرد، لە بن لێوانەوە:

له خەو و ناو خەونیٚ!

***

رۆژ تەواو لاربۆتەوە، پەلەیەتی زوو خۆ باوێتە زێی فرەهات و خۆی لە دووکەڵی ئاسمانی شنگال پاکباتەوە، تاو گەیشتۆتە زارکی ئەشکەفتیٚ، هەموو چاویان لەو باسکەی بەرانبەریان بڕیوە، کە دەڵێی باسکی یەکیٚ لە چل مێرەکانە، بۆ هەڵکێشانەوەی کەسێکی هەڵدێراوی درێژ کردووە، ئەو باسکەی دیرۆکزان و روو بە ماچ، بۆ سۆراخی رێی بەری رۆژاوا، رێی گەیشتنەوە بە ئاوەدانی، پێدا هەڵگەڕان و ئاودیو بوون، هەر دەبیٚ لەو باسکەوەش دەرکەونەوە، هەموو جگە لە کەژیٚ، برژانگیان بە باسکەوە گرێداوە.

سە سپیش، چاوی لە جێی چاوی ئەوانە، لە هیکڕا بە حەپ حەپ، لە ئەشکەفتیٚ دەرپەڕی، ئەوە نیشانەی نزیکبوونەوەی شتێکە، بۆنی شتێکی کردووە، هەشتسمێڵ بە دوایدا چوو، ئەوانیدیش، لە سەر چوون بوون، سە سپی گەیشتەوە زارکی

ئەشکەفتێ، کلکی خۆشیی بادەدا و حەو حەوی گەڕانەوەی دەکرد، گەیشتنەوە، دیرۆکزان و کوڕی روو بە ماچ هاتنەوە، لە روویان دیارە، رێی دەربازبوونیان دۆزیوەتەوە.

دیرۆکزان:

سبەی زوو بەڕێدەکەوین.

روو بە ماچ:

هەر کەسێ دەیەوێ پەیوەندی بە کەسوکاریەوە بکات، ها...

یەکێ لەوانەی بۆ رزگارکردنی ئێمە هاتوونەتە چیا، پاتریی مۆبایلەکەی خۆی دامێ.

کێ ژمارەی کێی ئەزبەرە؟! مۆبایلی کەسیش ئەو پاتریەی پێناکات، هەر یەکەو لە جێی خۆی لەگۆ وەبیرهێناوەی ژمارەی کەسوکارە.

خودێدە وەری گرت، ژمارەیەکی لێدا، لە دەرەوەی بازنە بوو، لێیدایەوە، چەند جار لێیدایەوە، نەهاتە ناو بازنە، بە گریانەوە:

تەنها ژمارەی دایکمم لەبەرە، ئەویش لە دەرەوەی ژیانە.

کوڕە کۆچۆیی چەندی سەریهێناو برد، ژمارەی خۆشی بیرنەکەوتەوە، هی کەسی ئەزبەر نەبوو.

کریڤۆ، ژمارەیەکی لێدا، کچەکەی ناو تەلەفۆنیّ گوتی: وەڵامت ناداتەوە.

پاش کەمیّ کردیەوە:

+ ئەلۆ، تۆ کێی؟

_ دایێ ئەزم...

پەیوەندیەکە پچڕا، چەند جار لێیدا، کەوتبووە دەرەوەی بازنە.

هەشتسمێلێ، وەریگرت، ژمارەیەکی لێدا، رۆیی، وادیارە هەڵگیرا، دەموچاوی گەشایەوەوە، دەستی بە (ها ها..) کرد، هێندەی نەمابوو بێتە قسە، بە ئاماژە گۆتیە کوڕی روو بە ماچ:

بیخە سەر رەنگ و دەنگ.

روو بە ماچ بە ئاماژە تێیگەیاند کە لێرە رەنگ نیە.

دایە دەستی دیرۆکزان، قسەی لەگەڵێ بکات:

+بەلێ، ئەو پیاوەی ئێوە کە کەڕولاڵە، لەگەڵ کۆمەڵێ کەس لە سەری چیای شنگالە، خەمتان نەبێ باشە، سبەی دێینە خوارێ، ڕێی دەربازبوون هەیە.

-کاکی من، بێژە برای من، ئەم باشین، لە شێخانین.

دیرۆکزان قسەی خوشکەی بۆ برا کردە زمانی ئاماژە، هەشتسمێڵ لە خۆشیا، هێندەی نەمابوو، باڵ بگرێ.

کەژێ، مۆبایلی وەرنەدەگرت، بە زۆر دایانێ، پاتریەکەی دەرهێنا، دیتی بە هی خۆی ناکات، بڕۆی تێکنا، خستیەوە سەری و ژمارەیەکی لێدا، لە دەرەوەی بازنە بوو، لێدایەوە، نەهاتە ناو بازنەوە.

ڕوو بە ماچ بە هەنسکەوە، ڕوو لە هەمووان:

بریا هی منیش لە دەرەوەی بازنە با.

دیرۆکزان دەستی خستە سەر شانی، ڕوو بە ماچ بە گریانەوە گوتی:

من بۆ خوشکمم، کرد، هەڵیگرت:

+ ئەلۆ برا.

_تۆ لە کوێی؟

دەنگی برا، دەنگگرێ، بە عارەبی هاتە گۆ:

خەمی خوشکت نەبێ، ئەو خودا بۆ منی کردووەتە دیاری، ئاگام لێی دەبێ.

یەکسەر دایخستەوە، چەندی زەنگم لێداوە، هەڵینەگرت، دایخست.

لەو ساتە جارێکتر ژمارەی خوشکی لێدایەوە، هەر لە دەرەوەی ژیان بوو.

هەشتسمێڵ بە ئاماژە لە دیرۆکزانی پرسی:

هەواڵی کەسوکاری تۆ:

دیرۆکزان:

باشن، هێشتا لە هەولێرن.

دیرۆکزان، یەك یەك دەستی بە سەر هەمواندا هێنا و گوتی:

سبەی دەچینەوە، ئاوەدانی.

روو بە ماچ:

دەچینەوە، من دەبێ داك و خوشكم ببینمەوە.

خودێدە:

چوونەوە بۆ كوێ؟ كەس نەما، ئێزیدی نەما.

كوڕە كۆچۆیی:

ئێزیدی جگە لە چیا، چیای شنگالێ، لە چ جێی دنیایێ پارێزراو نیە.

هەشتسمێل دەیویست شتێ بگەیەنێ، بەڵام كەس تێینەگەیشت.

گوڵەشلێرە زگ و گوپەكانی پڕ قسە بوون، رستەیەكی بۆ نەگوترا.

سە سپیش دەیویست شتێ بڵێ.

تەنها كەژێ، ورتەی لێوە نەهات، لە سیماشیەوە، نە مانەوە، نەچوونەوە، كەس هیچی نەخوێندەوە.

شەو داهات و چوونە تاریكایی ئەشكەفتەوە.

## هایێ...

## کەزی زەر

کریڤۆ، بە دەستی هەشتسمێڵ بە ئاگاهات، گەیشتە سەر کانیەکە، دەستنوێژی شووشت و بەرەو تاتە نوێژ سەرکەوتەوە، سە سپیش بە دوایەوە، بەر لەوەی نوێژ دابەستی، سەگ حەوێکی کرد، بەپرتاو پێلاوی لەپێکرد و کەوتە دوای، سە سپی سەرە و دوند رێی گرت، کریڤۆ باش بەرچاوی خۆی نەدەدیت، چەند جارێ کەوت و هەستایەوە، سە سپی، لە سەر تیشە شاخێ قیت راوەستا، خۆی گەیاندێ، لە سەر دوندی لە هەمۆو دوندان

بڵندتر کە هێندە لێیەوە دوور نیە، سە سپی بە سێ چوار باز دەیگاتێ، تارماییەك دیارە، تارماییەك تا دەست هەڵبڕی کەلەگەت، سەرەتا لە شەکانەوەی ئاڵا دەچوو، بە دیاریەوە راوەستا، پاش کەمێ، ئاڵا گۆڕا بۆ کچی کەزی زەر، هەوە، رێك راوەستاوە، پرچی کردۆتەوە داویەتیە بای سپێدەی شنگالێ، هەر تیسکێکی بە لایەکدا چووە، تاو ناتاوێکش بە لایەکدا دەکەون و خردەبنەوە و با بۆی دەکاتە چەند کەزیێ، باڵەکانی لێکردۆتەوە، هەر یەکەی بەلایەکدا، ئاسۆیی رایگرتوون، لەگەڵ بەژنی ستوونیی جوان دێنەوە، جوانیەك لە چ جوانیێ ناچێ، چەقۆکەشی بە دەستەوە.

کریڤۆ بە دیاریەوە، دەمی داپچڕیوە و حەپەساوە، پاشان سووڕایەوە، لە سەر یەك پێ نەرم نەرم، بە دەوری خۆیدا سووڕایەوە، لەپڕ خێرای کرد، لە شێوەی فرفرۆکە، هێند خێرا دەست و پێ و پرچ تێکەڵ بوون و لێك جودا نەدەکرانەوە، سووڕایەوە، هەر سووڕایەوە، کریڤۆ و سە سپی تووشی سەر سووڕە هاتن، چاویان داخست.

کریڤۆ چاوی کردەوە، کەزی زەر نەمابوو، سەیری کرد، سەسپی لەو واقوورِماوتر چاوی برِیوەتە دوندی بێ کچ، بە خۆو بە سەوە، ئەو ناوە هەموو گەڕان، بن بەرد، پەنا دار، ناو لق و پۆپان، ناو کەندرِ و زەندۆلان جێ نەما سەری پێدانەکەن، بە هەڵەداوان گەڕانەوە ناو ئەشکەفتێ، نیە، کچە کەزی لێرەش نیە، کریڤۆ لە بانگی دا، لە بانگدانێ، خودێدە کە بە تۆپی داعش وا زوو بە ئاگانەدەهاتەوە، راپەڕی، دیواری ئەشکەوت گرتیەوە، گوڵەشلێرە لە هارِژنی دا، کەمێ حێلتر با، هەشتسمێل گوێی دەبۆوە:

فڕی، کەزی زەر فڕی، بگەنێ.

هەموو دەوریان دا، دایاننیشاند، کوڕی روو بە ماچ :

کاکە، واز لەو نوێژی سبەینانە بێنە، وەك من لە دەمی تاوکەوتنێ بیکە، باشە وات بەسەرهات!

کریڤۆ:

ئەز دین نەبوومە، لە سەر دوندەکە، مینا فڕفڕۆکە تێر سووڕایەوە و نەما، فڕی، بە خودای فڕی، ئەگەر باوەڕ بە من ناکەن، لە سە سپی بپرسن.

هەموو چاویان بڕیە سەر سە، ئەویش بە شێوەیەك تەماشای کردنەوە، هی دیدڤانی بوو، (حەو.. حەو)ێکی هێند خەماوی کرد، رێك لە (بەڵێ، بەڵێ) دەچوو.

گوڵەشلێرە دەگریا، چاوی دەگێڕا، ئەو سەرو ئەوسەری دەکرد و یەکبینە دەیگۆ:

دادە، دادە...

گەڕان، توورەگەکەی بە لقی دار هەنجیرەکەوە بوو، جلکە پیاوانیەکەی لە دەو کانیەکە لە سەر بەردێکی پانی گەورە، بەردێکی خڕی گچکەی لە سەر دانرابوو.

هەموو، بە ئاقارێ وەربوون، هەر یەکە بە لایەکەدا، ئەو لا کەزی زەر، ئەم لا کەزی زەر، نەبوو، شیو و دوندی ئاقاری چل مێرا نەما، نەیکەن، بن بەرد و سەر درەخت نەما نەیپشکنن،کەس شوێنپێشی نەدیتەوە.

به نامرادی هاتنەوە بن کەڤرەکە، بەر دەم ماڵە هەنجیریی کەزی زەر.

هەشتسمێل، دەستی بۆ ئاسمان هەڵبڕی، هەموو سەیری جێ دەستی ئەویان کرد، پەلە هەورێکیی سپیی درێژکۆڵە، بە ئاسمانەوە، پێدەچوو بە هەڵە لەو دەمەی ساڵێ، رێی کەوتبێتە ئاسمانی چیای شنگالێ.

هەشتسمێڵ، بە ئاماژەی پەنجەکانی کەزی زەری دەنەخشاند، ئەو لە نەخشاندنی ئەو کچە زۆر پەنجە رەنگین بوو، هەموو بە ساناهی لە زمانی پەنجەی وی تێدەگەیشتن و دەیانزانی مەبەستی ئەوە، بە پەنجە و چاو دەیگۆ:

نابینن؟ ئەها، ئەوەتا کەزی زەر، بە ئاسمانەوەیە، هەوە، ئەوە هەور نیە، ئەوە

هەشتسمێڵ سوور بوو، لە سەر ئەوەی ئەو پەلە هەورەی سەر ئەو دوندە بڵندە کەزی زەرە.

کوڕە کۆچۆیی، ئاخێکی قووڵ هەڵدەکێشێ و بە بەزەیییەوە دەڕوانێتە هەشتسمێڵ:

هەمووومان شێت دەبین.

گوڵەشلێرە پەنجە بۆ سەر لقە دارێ، کە مەلێکی بە سەرەوەیە درێژدەکات:

دادە، ئۆتە، دادە.

هەر مەلێ بەوێدا دەفڕێ، پەنجەی بۆ درێژ دەکات و بە:

دادە، دادە...

چەند شەقاوێ دەکەوێتەی دوای. گوڵەشلێرە هەموویان دەگرێنێ.

کوڕی روو بە ماچ، لە هیکرا:

نەتاندی؟

دەست بۆ باسکەکەی ڕێی رۆژاوا درێژدەکات:

باوەڕتان بێت، کەسێك لە رۆیینی دیار بوو، ژنە، لەوێوە ئاودیو بوو.

دیرۆکزان دەڵێ:

+چاوت رێشکە و پێشکەی کردووە، تۆش خۆت شێت مەکە.

-من دڵنیام.

دیرۆکزان، پەنجەی وەبیرهاتنەوەی بۆ لاسەری خۆی برد:

ئا، دەفتەرەکە.

بەرزە پێ هەستا و سوورایەوە و سەرکەوتەماڵی کەزی زەر، توورەگەکەی هێنا، دەستی تێدا گێڕا، بە گۆڕێی وەرکرد، نەبوو، دەفتەرەکە نەبوو، کەژێ تەنها دەفتەر و چەقۆکەی لەگەڵ خۆی بردبوو.

دیرۆکزان هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا:

دەفتەرەکە مابا، دەگەیشتینە سەرە داوێ..

وردەواڵەکانی کردەوە توورەگەکە:

حەیف ئێزیدی چ نووسراوێ لە دوای خۆیان بەجێناهێلن، هەموویان زارەکین، خۆزی زوو خۆم دەگەیاندە دەفتەرەکەی کەزی زەر.

لەو دەمە، سە سپی، سێ چوار (حەو..حەو..حەو)ی بە دیارکەوتنەوەی کرد و باڵی گرت، کەوتنە دوای و هەموو یە یەك دەنگ:

کەزی زەر، کەزی زەر، کەزی زەرە...

گەیشتنە سەر بستیەك، دیتیان سە سپی لەو سەرەوە، لۆژ لۆژ دەگەڕێتەوە، گوێیەکانی شۆڕکردۆتەوە.

کریڤۆ بەردێکی هەڵگرتەوە تێیگرێ، پەژیوانبۆوە، لەو دەمە هەموو، بە هەشتسمێلّ و سە سپیشەوە، گوێیان هەڵخست، لە لووتکەکانەوە دەنگی تەنبوور دەهات، دیرۆکزان گۆتی:

گوێتان لێیە؟ تەنبوور (شنگال هایێ) دەلێتەوە.

دوای کەمێکیتر، سە سپی، حەو و باڵگرتنی دووبارەکردەوە، ئەو جارە زوو گەڕایەوە، چەند جارێ و ڕۆیشت و گەڕایەوە، بەرانبەریان هەڵتووتکا، سەری شۆڕکردەوە، چاوبەرەژێری پێوە دیار بوو، حەو حەوێکی کرد لە گریانی مرۆ دەچوو، گوڵەشلێرە لەگەڵی گریا، هەشتسمێلّ بە دوای ویدا، کوڕی روو بە ماچ لەگەڵ ئەو تەنبوورەی لە هەموو لایەکەوە دەهات:

هایێ، هایێ، دە هایێ

شنگال ل من هایێ

کەزی زەریّ..

هەموو لیّیان وەرگرتەوە، سە سپیش بە ئاوازەییّ دەیقرووسکاند، لەگەڵ هاییّی گوڵەشلیّرەوە و سەر بادان و جولانەوەی هەشتسمیّڵ ریّك دەهاتەوە:

هاییــــــــــــــــیّــــــــــــــیّ، ها...